84

ساڵی هەشتەم

حوزەیرانی ٢٠١٥






یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

بڕیار تەمەنێک لە گوڵباران!

پەیکەری بڕۆنز تۆ گەورەی بزەی منداڵ

# لە بڕیاردا

## پەنجەکان سەرکەوتن تۆمار دەکەن
## یەکتری ناشکێنن!



No: 84

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـــارس

زاهـیــر زانـــا

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـا محەممەد

گوڵان حەمەئەمین

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر:- ئازاد محێدین

بەشی هونەریو دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کلسوم جەلال

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٣٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com



bryarmagazine

دابەشکردن

کۆمپانیای پەیك/ 07708649210

چاپ

کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

کارگێڕیو بازاڕسازی




# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی هەشتەم - ژمارە 84 - حوزەیرانی 2015











# تەمەنێک لە گوڵباران!

لەگەڵ ژمارە (٨٤)دا، بڕیار پێ دەنێتە هەشت ساڵی تەمەنییەوە! هەشتاوچوار مانگ لە تەمەنی پڕشکۆی بڕیار تێدەپەڕێت، (٨٤) وەرزی گوڵچنینو (٨٤) ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ڕۆژنامەگەریی کوردیی ناوازەو جیاواز!

تەمەنێك لە گوڵبارانو گوڵاوپرژێنی دڵ!

مانگانە، بڕیار وەکو شنەیەکی فیردەوسیو ئاوازێکی بەهەشتی دێتو فێنکی بە ڕۆحمان دەبەخشێت!

بڕیار لە سەرماو بەستەڵەکی زستان باوەشی گەرمو لە چلەو قرچەی گەرمای هاوینا سروەی فێنكو لە تاریکترین شەوانا چراو لە دژوارترین ساتە وەختا هیواو موژدەی خۆشە!

بڕیار دەستی گرتینو بە مرۆڤستانی ئاشنا کردینو دەستلەملانی مرۆڤە پاكو بەرزو گەورەکانی کردین.

بڕیار بە ڕۆحە بێگەردو دڵە سپیە ئاودامانەکان ئاشنای کردین!

لە ژێر سیڤانی بڕیاردا، ئارەقی ماندوبوونمان سڕیو پشوومان دا بە ڕۆحمان!

چەند خۆشە بەهێمنیو وتەی نەرمو چرپەی ناسك لەگەڵ ناخی خۆتدا بدوێی!

چەند خۆشە مامۆستایەکی میهرەبان، وەکو دایکێك ئامۆژگاریت بکا!

چەند خۆشە هاوڕێیەکی بەوەفا، هەموو ئاواتی سەرکەوتنو کامەرانی تۆ بێ!

چەند خۆشە ئەویندارێکی ڕاستگۆ، کە پڕ بە دڵی خۆشی دەوێی!!

چەند خۆشە سالیکی ڕێگایەك بیت، ڕۆژانە بەسەربالّی نوورا هەڵکشێی بەرەو ئاسمان!

بڕیار مانگانە دەستی پڕ لە میهرو خۆشەویستی ڕادەخات بۆ مێشکە ماندووەکان، پەپوولەئاسا وەکو خەندەیەکی ئەرخەوانی لەسەر لێوی دڵە شکاوەکان دەنیشێتەوەو دەستەکانیان پێ لە ئەژنۆ دەترازێنێ!

بڕیار باشترین هاوڕێو هاودەمەو گرنگی بە هەموو وردەکارییەکانی ژیانتان دەدا!

چونکە لای وایە جوانیی ژیان، بە گرنگیدانە بە هەموو وردەکارییەکان!

هەموو ساتەکانی ژیان لای بڕیار گرنگی خۆی هەیەو پێویستە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو بین بۆ هەموو ساتو چرکەکانی ژیانمان!

بڕیار بە یەکەم دڵۆپ تینوێتیتان دەشکێنێو بە گوفتار کارگێڕیتان لا ئاسان دەکاتو بە چیرۆك بەڕێوەبردنی ژیانتان پێدەڵێت.

بڕیار دەیەوێت سەرکردە بنو لە قەیرانی بێسەرکردەیی قوتاربن!

بڕیار دەیەوێت کەسێکی لەشساغو تەندرووست بیتو بزانی چی دەخۆیتو چی دەکەیت!

بڕیار دەیەوێت هێندە زیرەكو لێهاتوو بیت، کە وشەت گەوهەرو وەڵامت بەجێ بێ!

بڕیار دەیەوێت بەرامبەر ناڕەحەتییەکان، بەهێزبیو وێڕای ماندوێتیو سەختیی ڕۆژگار بیرت نەچێ گۆرانی بڵێی بۆ ژیان.

بڕیار خاوەنی پەیامێکی بەرزە بۆ پەروەردەکردنی ماڵو خێزانو مندالّە نازدارو جگەرگۆشە خۆشەویستەکان.

بڕیار ڕۆحێکی بەهێزو سەرکەشەو وزەبەخشە بە هەموو مرۆڤەکان بێ جیاوازی.

پێت دەڵێت: بڕوانامەی بەرز، دەوڵەمەندی، پلەوپایە ئەمانە تاکە فاکتەری سەرکەوتن نین، بڕۆن سەرکەوتووەکان بێ قوتابخانەو ئەومنداڵە بێباوکانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی بخوێننەوە.

لە بڕیاردا بچنە حزووری زانکۆی ئەوینو لە دیوانی شیعرو ئەدەبی کوردییەوە وانەی ئەوینو خۆشەویستی بخوێنن.

لەگەڵ بڕیاردا خاوەنی خۆت بەو بڕیار بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیانی خۆت بدە.

# کارگێڕی بە گوفتار



**- زانست وەکو زەوی وایە، تەنها دەتوانین ببین بە خاوەنی کەمێکی کەمی.**

ڤۆڵتێر

**- پێنووس، بە دەستی کەسی نەزانەوە، وەك خەنجەر وایە، بە دەستی منداڵەوە!**

نەزانراوە

**- کتێبخانە لە جوانکارییەکانی ژیان نییە، بەڵکو لە پێداویستییەکانی ژیانە، مرۆڤ شایەنی پەروەردەکردنی منداڵ نییە، ئەگەر کتێب چواردەوری نەدابێت!**

بیچەر

**- ماندوو، لەسەر سەرینی بەردینیش دەنوێت؛ بۆئەوەی پشوو بدات، بەڵام تەمەڵ، لەسەر سەرینی پەڕو ئاوریشمیش، ناتوانێت پشوو بدات!**

شکسپیر

**- بە ڕواڵەتو جلوبەرگ فریو مەخۆ، ئەو کەسەی بە دوای مرواریدا دەگەڕێت، دەبێت بڕواتە قووڵایی دەریاکان!**

جۆن درایدن



# داوا بکە، هەوڵ بدە، دەستت دەکەوێ!

لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری مەیامی ئەمریکا، ژنو پیاوێك، کە تازە هاوسەرگیرییان کردبوو، ماوەیەکی کەمیش بوو، پەیوەندییان بە بەرنامەیەکی ڕاهێنانو فێرکارییەوە کردبوو بۆ پاراستنی منداڵان لە زیانی ماددە هۆشبەرەکان.

پیاوەکە دەڵێت: ڕۆژێکیان، داوەت کراین بۆ کۆنفرانسێکی فێرکاری لە شاری ـ سان دیگۆ ـ ئەو کۆنفرانسەش زۆر گرنگ بوو بۆ ئێمەو پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە بوارەکەی ئێمەوە هەبوو! زۆرمان حەزدەکرد بەشداریی بکەین، بەڵام پارەی پێویستمان نەبوو بۆ ئەو سەفەرە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارمان دا بەشداری بکەین!

بۆ ئەم مەبەستەش، تێچووی گەشتەکەمان کرد بە چەند بەشێکەوە:

یەکەم شتێك کە کردم، وەکو هەنگاوی یەکەم، پەیوەندیم کرد بە ڕێکخەرانی کۆنفرانسەکەوە، بۆم ڕوون کردنەوە کە بەشداریکردن بۆ ئێمە چەندە گرنگە، بۆ ئەم مەبەستەش، داوام لێکردن کە داوەتنامەیەکی بێبەرامبەرمان پێ ببەخشن، ئەوانیش ڕەزامەندیی خۆیان دەربڕیو بەم شێوەیە، لە بەشی یەکەمی بەرنامەکەماندا سەرکەوتوو بووین!

هەواڵی ئەم سەرکەوتنەم، بە خێزانەکەم ڕاگەیاند، بەڵام ئەو گوتی: ئێمە لە "مەیامی"ینو کۆنفرانسەکەش لە شاری ـ سان دیگۆ ـ یەو پێویستمان بە هۆکاری گواستنەوە هەیەو ئێمەش لە تواناماندا نییە!

ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە هێڵێکی گواستنەوەی ئاسمانی کرد بە ناوی " هێڵی باکووری ڕۆژهەڵات، خۆشبەختانە ئەو کەسەی وەڵامی پەیوەندییەکەی دایەوە، سکرتێری بەڕێوەبەری گشتیی هێڵ بوو. منیش بابەتەکەم بەجوانی بۆ ڕوون کردەوەو داوام لێکرد کە ئایا دەتوانێ دوو بلیتمان بێ بەرامبەر پێ بدا؛ بۆ چوون هاتن؟!

ئەویش بەخۆشحاڵییەوە ڕازی بوو، وێڕای ئەوەی کە سوپاسی کردم لەسەر ئەوەی من بەم پرسیارەم بوارم بۆ ڕەخساندووە، تا کارێکی باش ئەنجام بداتو یارمەتی پێشکەش بە کەسانی دی بکات!

منیش سوپاسم کردو ڕووم کردە خێزانەکەم، تا ئەم هەواڵە خۆشەی پێ ڕابگەیەنم، بەڵام دیسان گوتی: ئەی بۆ مەسەلەی مانەوە چی بکەین؟

هاوکات دوابەدوای قسەکانی ئەو، پەیوەندیم بە ئوتێل "هۆڵیدەی ئێن" کرد لە "مەیامی"و پرسیاری بارەگای سەرەکیم کرد، پێیان ڕاگەیاندم کە لە "سان فرانسیسکۆ"یە، توانیم پەیوەندی پێوە بکەمو کێشەکەی خۆمی بۆ باس بکەم، ئەویش بێ سێو دوو، ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی بۆ میوانداریمان لە یەکێك لە لقە نوێیەکانی ئوتێل "هۆڵیدەی ئێن"، بەڵام لە دواییدا گوتی: ئاگادار بە هاوڕێم، نێوان ئوتێلەکەو شوێنی بەستنی کۆنفرانسەکە، زێتر لە "٤٠٠" میلە، دەبێت لە هەوڵی دابینکردنی هۆکارێکی گەیاندندا بیت!!

گەڕامەوە بۆ لای خێزانەکەم، هەمووم بۆ گێڕایەوە، پێم گوت: کە ئێمە لە دابینکردنی زۆربەی پێداویستییەکانی بەشداریکردن لەو کۆنفرانسەدا، سەرکەوتوو بووین، تەنها شتێك کە مابێت، پەیداکردنی هۆکارێکی هاتووچۆیە لە نێوان ئوتێلو شوێنی کۆنفرانسەکەدا!

زۆر بیرمان کردەوە، لە کۆتاییدا بەبیرم هاتەوە؛ من هاوڕێیەکی کۆنم هەیە، کە پێشتر لە کۆمپانیایەکی بەکرێدانی ئۆتۆمبیلدا کاری دەکرد!

هاوکات پەیوەندیم پێوە کردو لە نووکەوە، هەموو شتێکم بۆ باسکرد!

یەکسەر گوتی: ئۆتۆمبیلێکی فۆرد گونجاوە؟

منیش گوتم: بەڵێ، زۆرباشە!

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- سەختترین ئامانج، ئەگەر هەوڵی بۆ بدەینو کاری بۆ بکەین، دەیگەینێ.

٢- هیچ کارێك، بەرامبەر کۆڵنەدانو هەوڵدانی بێوچان، ناتوانێ خۆی بگرێ.

٣- دەتوانی گامێشێك قووت بدەی؟ ڕەنگە پێت سەیر بێ، بەڵام بڵێ: بەڵێ؛ چونکە دەتوانی! دڵنیام زۆر بەئاسانی دەتوانی!

پارچە پارچەی بکە، هەر ڕۆژەی کیلۆیەکی لێ بخۆ، کاتێکت زانی هیچ نەما!

٤- کەواتە: ئەگەر کارەکانت گەورەبوون، دابەشیان بکە، پارچە پارچە ئەنجامیان بدە، ئەوسا گامێش قووتدانت لا دەبێتە ئاوخواردنەوە!

٥- پێویستە بزانی چیت دەوێ! بۆ دەتەوێ، بزانی بەرامبەر تێبگەیەنی، تا هاوکاریت بکات، بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێت پەیامت ڕوون بێو توانای گەیاندنیت هەبێ.

٦- ئەگەر بەردەوام بیتو کۆڵ نەدەیتو بێهیوا نەبیت، دڵنیابە؛ ئەوەی دەتەوێ هەر ئەنجامی دەدەیت.

٧- بۆئەوەی کەس نەڵێت: ئەم ڕووداوە خەیاڵییەو دوورە لە واقیع، من ڕووداوێك کە خۆم خاوەنیمو دەقاودەقە لەگەڵ ئەم ڕووداوە، بۆتان دەگێڕمەوە، بەڵام لە ژمارەی داهاتوودا بە ویستی خودا.. چاوەڕوان بن!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

(هێنری جیمس)

بە فرمێسکی تیمساح فریو مەخۆ؛ چونکە تیمساحەکان دوای قووتدانی نێچیرەکانیان، فرمێسکەکانیان هەڵدەوەرێنن!

(نەزانراوە)

ئەگەر ناتوانیت ببیتە ئەستێرەیەک لە ئاسمان، ببە بە چرایەک بۆ ماڵەکەی خۆت!

(سۆفۆکلیس)

یاساکانی سرووشت، لەسەر حەق و ڕاستی و دادپەروەری بنیاتنراون، بەڵام یاساکانی مرۆڤ، لەسەر فێڵ و تەڵەکە و ستەم بنیاتنراون!

(فوڤنارگ)

هەژاری ناتوانێت، دەروونبەرزەکان سەرکز بکات، دەوڵەمەندیش ناتوانێت، دەروونبەزیوەکان سەربەرز بکات.

(لوقمانی حەکیم)

تووڕەبوونی مرۆڤی نەزان لە قسەکانیدایە، بەڵام تووڕەبوونی مرۆڤی عاقڵ، لە کردەوەکانیدایە!

سامان کەریم

بەشی یەکەم

# پێناسەی پلان بەشێوەیەکی گشتی:

پلان واتە: بەرنامەڕێژی بۆ هەموو کارێکی ڕۆژانە، واتە: هەر کەسێك بەپێی پسپۆڕی خۆی لە بوارێك لەو بوارانەی کاری تێدا دەکات دەبێت پلانی هەبێت، پلان یەکێکە لە بەشە گرنگەکانی ژیان، بەبێ پلان، ژیانیش تامو چێژێکی وەهای نابێتو هیچ شتێك مانای خۆی نادات بەدەستەوە، نرخی ئەو کاتە نازانین، کە خودا پێی بەخشیوین، نازانین ژیانی ڕۆژانەمان چۆن بەڕێ بکەین.

پلان واتا سیستم، هەر وڵاتێکیش سیستمی نەبێت، وڵات نییە؟ سیستمیش پێویستە بەشێوەیەك دابڕێژرێت، کە هەموو شتێك، وەك چرکەژمێری کاتژمێر وابێتو بێسەروبەری درووست نەبێتو هەموو شتێك لەشوێنی خۆیدا بێتو هەموو شتێك ئەوی تر تەواو بکات.

**مەبەستمان لە سیستم چییە؟**

مەبەستمان پێی نەهێشتنی ئاستەنگەکانی ژیانە، لە ژیانی هاوڵاتیدا.. کە هەموو ئەمانە ئەرکی حکومەتە، بێ هیچ پاساوێك دابینیان بکات بەباشترین شێوە، زۆرێك لەو ئاستەنگانە، پێداویستی سەرەتایین؛ وەك (شوێنی نیشتەجێبوون، کارەبا، ئاو، ڕێگاو بان)، هەندێ پێداویستی تر پەروەردەو فێرکردنن؛ وەك (خوێندنگا، زانکۆ) دیارە کە باسی پەروەردەو فێرکردن دەکەین، دەبێت سوودێکی وەها بە هاوڵاتیانت بگەیەنێت، کە بیانکەیت بەداهێنەر بۆ وڵاتەکەت، نەك بە مشەخۆر، یان بارێکی قورس بۆ سەر کۆمەڵگاو ژیان. بەشێکی تر ئاستی بژێوی و داهاتی ئابووری کە نابێت هیچ کەس لێی بێ بەش بێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت بزانین ئابووریی وڵاتت بە ژێرخانو سەرخانی، داهاتی سنوورەکانو ناوخۆی وڵات بزانین، ئینجا خەرجییەکانی حکومەتی لێ دەربکەیتو بەشێك پاشەکەوت بکەیت؛ بۆ پێشهاتی کتوپڕو بەشێکی بۆ خزمەتگوزاریی گشتیو بەشێکی بەش دەکەیتەوە بەسەر ئەو هاوڵاتییانەی کە شایستەی ئەو هاوکارییەن.

هەر وڵاتێك پلانی تێدا نەبێت، ئەو وڵاتە، تا بێت بەرەو دواوە دەڕواتو لەگەڵ وڵاتانی تردا ناتوانێت پێشبڕکێی پێشکەوتن بکات، بەڵکو دەبێت بە وڵاتێکی مشەخۆرو تەنها بەکاربەرێکی زیانبەخش دەبێت. گەر سامانی سرووشتیو ژێرخانی ئابووریشی نەبێت، ئەوا دەبێت بەبارێکی قورس بەسەر ژیانیشەوە، کە کار دەکاتە سەر خراپبوونی نەك کۆمەڵگاکەی خۆی، بگرە زەویش، گەر هەرێمێکی وەك هەرێمی کوردستان وەربگرین، دەبینین ئەو هەموو داهاتە کە لەم دواییەدا دۆزراوەتەوە، لەناوچەکە کەچی تابێت بەرەو دواتر دەگەڕێینەوەو سوود لەو داهاتەش وەرناگرین؟!

لەبەرئەوەی کۆمەڵێك، دەستیان بەسەر داهاتی وڵاتدا گرتووە، کە لەداهاتوودا نەخۆیان سوودی لێ وەردەگرن، نە دەهێڵن خەڵکیش سوودی لێ وەربگرێت، چونکە کاتێك حوکمڕانی ئەم وڵاتەیان گرتە دەست، ئەم سەروەتو سامانە، بوونی نەبوو، بەشێکی زۆری تاوانەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی بەهەر شێوازێك بێت، خۆیان وابەستە کردووە بەوانەوە. بۆیە دەبینین، تا بێت ڕەوشی ژیان لەناوچەکە بەرەو خراپتر دەڕواتو هەموو جومگەکانی ژیان، تابێت بەرەو ئاستەنگو گرفتی زیاتر دەڕۆن! بۆیە بەباشم زانی، بەم ئەرکە هەستمو خودا پشتیوانم بێت کوردستان لەم کەناری مەرگەی کە ئەوان بەرەو ڕوی دەمانبەن، ڕزگار بکەین.

لەبەرئەوەی گەر لەئێستاوە دەست پێ نەکەین، ڕەنگە ڕۆژگارێك بێت دەست بە چاکسازیکردن، زۆر درەنگ بێت؛ بۆیە بەپشتیوانی خودای گەورە دارشتەی چەندین پلانی بەهێز لەمێشکمدا ئامادەیە، کە لەدارشتنی یەك بەیەکیاندامو دابەش دەبن بەسەر دوو تەوەردا، تەوەری پلانی بنچینەییو تەوەری پلانی لاوەکی.

**پلانی بنچینەیی:** مەبەستمان پێی هەموو ئەو پلانانەیە کە خەڵك بەگشتی دەگرێتەوەو دەبێت دوای دارشتنو ڕاوێژکردنو هەڵسەنگاندنی بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوەو هەموو لایەنەکانی هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێتو بەردەوامی پێ بدرێت؛ بۆئەوەی ئەو سیستمەی کە خەوی پێوە دەبینین، درووستی بکەینو ئەسپی پێشکەوتنی کورد لە هەموو ئاستەکاندا تاو بدەین؛ بۆئەوەی هەر نەبێت وڵاتانی چواردەوری خۆمان بگرینەوەو زۆرتر لێیان دوور نەکەوینەوە.

**تەوەری دووەم:** تەوەری پلانی لاوەکییە، ئەو پلانانە دەگرێتەوە، کە چینێکی تایبەت لە خەڵك دەگرێتەوە، پەیوەست نییە بە پلانی بنچینەییەوە، بەڵام کار لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵگا دەکات.

هەموو ئەوپلانانەی کە مەبەستمانە دەبێت، وەك تۆڕێکی پێکەوەیی بن، واتە: هەریەکێك ئەوی تر تەواو بکات، یان پەیوەندی بە پلانێکی ترەوە هەبێت لە هەموو شتێکدا، یان لە چەند خاڵێکدا.. یان چەند پلانێك، چەند خاڵێکی هاوبەشیان پێکەوە هەیە. پلانە بنچینەییەکان، شێوازی بازنەیی وەردەگرن،

پلانە لاوەکییەکانیش شێوازی درەختی، ڕەنگە هەندێك پلانی لاوەکی، پەیوەندی بە پلانی بنچینەییەوە هەبێت، یان نەبێت.. گرنگ ئەوەیە لەبناغەدا، هەموو پلانەکان بۆ سوودی گشتی دادەنرێت، یان سوودی کۆمەڵێك، واتە: مەرج نییە لاوەکییەکان هەموو تاکێك لێی سوودمەند بێت، بەڵام وەك وتمان نەتەوە لێی سوودمەند دەبێت بەوەی دەبێتە شارستانیەت لەداهاتوودا.

با نموونەیەك بهێنینەوە، کاتێك مامۆستایەك دەچێت بۆ قوتابخانە، دەبێت پلانی بۆ کارەکەی بریتی بێت لەچی؟ دیارە پلانی مامۆستا زۆرە، بەڵام تەنها بۆ تێگەیشتنێك لەبارەی پلانی ڕۆژێکی مامۆستا. دەبێت پێش ئەوەی بچێت بۆ قوتابخانە، وانەی ئەو ڕۆژەی ئامادە کردبێت، هەروەها هێندە بیرتیژ بێت، چەندین پرسیار لەسەر وانەکەی ئەو ڕۆژەی لەخۆی بکات، کە وا بزانێت خوێندکارەکانی لێی دەکەنو لای خۆی بینووسێتەوە گەر خوێندکارەکانیش ئەو پرسیارەیان لێ نەکرد، خۆی ئاماژەی پێ بکات بەوەی بڵێت خوێندکارێك ئەم پرسیارەی هەیە، هەر خۆی وەڵامی ڕاستی پرسیارەکەش بداتەوە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی نەك خوێندکارێکی پرسیارێکی لێ بکاتو وەڵامی پێ نەبێت بۆی؟ تاکو وا نەزانن مامۆستاکەیان زانیاریی کەمە؟ دەبێت لەسەر کۆی پسپۆڕییەکەشی زانیاری باشی هەبێت، لە هەر وانەیەکدا بەشێك لەو زانیارییانەی خۆی کە پەیوەندی بە وانەکەوە هەیە، بە خوێندکارانی بڵێت. ئەمە پلانی مامۆستایەك بۆ ڕۆژێکی خوێندن.

یان کاتێك دەچیت بۆ بازاڕ، دەبێت ئەو شتانەی دەتەوێت، لای خۆت بینووسیت، بەشێوەیەك کە پاشو پێشیان نەخەیت، بەپێی ئەو دوکانانەی کە پێداویستییەکانتی لێیە، نەك دوکانێك لەم سەری بازاڕ بکەیت، ئینجا بگەڕێیتەوە بۆ ئەوسەری بازاڕ، بەو شێوازە کاتێکی زۆرت لێ دەڕوات، بێئەوەی کارەکانیشت بەباشی ئەنجام دابێت.. دەشبێت پێشتر بزانیت چیت دەوێت، نەك لەخۆتەوە شت بکڕیتو زیادە مەسرەف بکەیت، دوایش دەڵێیت ئەم پارەیە، لەخۆیەوە تەواو دەبێت، بەدڵنیاییەوە تۆ بەرنامەی سەرفکردنی پارەت نەبێت، هەموو دنیا پارە بێت بەشت ناکات.

ئەم دوو پلانە، بەشێوەیەکی سادە سەبارەت بە دوو هاوڵاتی بوو، کە مامۆستایەكو بازارگەڕێك بوو، کە بەداخەوە زۆرێکمان ئەم بەرنامەڕێژییەمان نییە بۆ سادەترین شتی ژیانی خۆمان، بەڵکو تەنها ڕۆژانە کاتێکی زۆر بەفیرۆ دەدەین، بێئەوەی هیچ سوودێکی مادی، یان مەعنەوی بەدەست بهێنین.

تا ڕادەیەك هەرچەندە نابێت، بەڵام گەر تاکو خێزان ئەم بەرنامەڕێژییە وردەی بۆ ژیانی نەبێت، وەك گوتم نابێت، ڕەنگە ئاسایی بێت! بەڵام کارەسات ئەوەیە کە حکومەت پلانی نەبێت بۆ بەڕێوەبردنی وڵات. بۆیە ئەوەی ئێمە مەبەستمانە داڕشتنی پلانە بۆ سیستمی حکومڕانی، واتە: بۆئەوەی ئەو دەوڵەتەی کە هەمووومان خەوی پێوە دەبینین، درووست ببێت.. دەبێت بە پلانی بەهێز بنیاتی بنێین، لەبەرئەوەی دەوڵەت بەکردەوەو هەنگاونان درووست دەکرێت، نەك بە قسەو دروشمو خورافیات؛ چونکە بەبڕوای هەموو لایەك، پلان تائێستا بوونی نەبووە.

### سیستمی حوکمڕانی:

سیستمی حوکمڕانی لە هەموو وڵاتێکدا، لەسەر چەند پایەیەك دەوەستێت، کە ئەو پایانە نەبێت، سیستمی حوکمیش لاسەنگ دەبێت؛ چونکە دەبێت وڵات بەشێوەیەك بەڕێوە ببرێت، کە داخوازی هاوڵاتیان جێبەجێ بکات.

پایەکانی حوکمڕانی لە هەموو دەوڵەتێکی دنیادا، گرنگیی خۆی هەیە، بەڵام لەم هەرێمەی ئێمەدا، نەك گرنگی پێ نادرێت، بەڵکو بەتەواوەتی فەرامۆش کراوە.. وەك لەم وێنەیەی خوارەوەدا بەتەواوی ڕوونی دەکەینەوە:

پەیکەری حوکمڕانی لە هەر وڵاتێکدا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لەم سێ پایە گرنگە پێکدێت:




### پایەیەی یەکەم/ پلان

پلان واتە: داڕشتنو بەرنامەڕێژی بۆ هەموو سێکتەرە گرنگەکانی ژیانی هاوڵاتیان، بەپێی گرنگیی هەموو ئەو بوارانەی کە لە ژیانیاندا بوونیان هەیە، حکومەت ئەم بەرپرسیارێتییەی لە ئەستۆدایە بەوەی کە دەبێت پلانی هەبێت بۆ هەموو بەشێکی حوکمڕانی، هەر پلانێکیش پێکدێت لەسێ جۆری سەرەکی کە بریتین لە:

١. **پلانی ئێستایی:** واتە: ئەو پلانەی کە ڕاستەوخۆ جێبەجێی دەکەیتو ئەنجامەکەشی دوای ماوەی ٦ مانگ بۆ ساڵێك دەبینی. وەك (پلانی سەرژمێریی).

٢. **پلانی ناوەندی:** کاتێك جێبەجێی دەکەیت پاش (٣ بۆ ٥) ساڵ ئەنجامەکەی دەبینی. وەك (پیشەسازی).

٣. **پلانی دوورمەودا (ستراتیجی، یان درێژخایەن):** کە ئەمەیان ڕاستەوخۆ جێبەجێی دەکەیت، بەڵام دوای ١٠ ساڵ بەرەو سەر، ئەنجامەکەی دەبینی، بەڵام ئەم پلانە مەرجی سەرەکی بوونی داتای ڕاستە، بۆ هەر بوارێك کە بتەوێت ئایندەی پێ بنیات بنێیت. وەك (پلانی پەروەردەو فێرکردن).

بەڵام هەندێك پلان، هەرسێ بەشەکەی سەرەوەی تێدایە، وەك پلانی (سەرژمێریی گشتیی دانیشتووان)، کە دواتر گرنگییەکەی باس دەکەین، کە بۆچی هەرسێکیانی تێدایە، هەروەها وەك بۆچوونی خۆم، پلان لەڕووی گرنگییەوە، دابەش دەبێت بۆ دوو جۆری سەرەکی:

**یەکەم: پلانی بنچینەیی:** ئەم پلانە پەیوەندی بە هەموو کۆمەڵگاوە هەیە بێ جیاوازی، بە هەموو ئایدۆلۆژیاو بیروبۆچوونێکی جیاوازەوە.. واتە: سوودی ئەو پلانە، بۆ هەموو کۆمەڵگایە. وەك پلانی (سەرژمێری + کارەبا + ئاو + تەندرووستی + پەروەردە، .... زۆری تریش).

**دووەم: پلانی لاوەکی:** ئەم پلانە بەشێکی کۆمەڵگا تێیدا بەشدارە. واتە: پلانەکە بۆ نوخبەیەکی دیاریکراوە، بەڵام کۆمەڵگای پێ پێش دەکەوێت. وەك پلانی (هونەری +وەرزشی + ڕۆژنامەگەری + خوێندنەوەو نووسین).



# دیدارێك لەگەڵ بەڕێز (مامۆستا محەممەد فەخرەدین جەباری، مامۆستای زانکۆی سەلاحەدین) سەبارەت بە ڕەوشی خوێندنەوە لەکوردستاندا.

**- باردۆخی خوێندن لە هەرێمی کوردستاندا، لە چ ڕەوشێکدایە دەبینیت؟ باشە، یان خراپ؟**

* لە ڕاستیدا ئەگەر بمانەوێت، بە شێوەیەکی زانستی دۆخی هەر بوارێك هەڵبسەنگێنین، پێویستە ئامارو داتای پێویستمان لەبەردەستدا بێت، بۆئەوەی بتوانین بە شێوەیەکی ئەکادیمی ئاستو ڕەوشەکەی دیاری بکەین، پرۆسەی خوێندنیش، یەکێکە لە بوارە ئەکتیڤو زیندووەکانی ژیان. گرنگە بەوردی لەسەری بوەستینو خوێندنەوەی بۆ بکەین، بە بۆچوونی من، ئاستی خوێندن ئەمڕۆ لە هەرێمی کوردستاندا لە دۆخێکی چەقبەستوودایە، وا نابینم هەنگاوێکی گەورەی بەرەو پێشەوە نابێت؛ چونکە بڕبڕەی سەرکەوتنو پێشکەوتنی خوێندن، سیستەمێکی پێشکەوتوو تەندرووستو میتۆدێکی زانستی ئەزموونکراوە، بەداخەوە میتۆدی خوێندن لای ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی حەفتاو بێگومان دیارە بە عەقلیەتی سالانی پەنجاو شەستەکان نووسراوە، ئەمەش بۆ ئەم سەردەمی پێشکەوتنە، پاشکەوتنێکی گەورەیە.

**- ئایا سیستەمی پەروەردەی (سویدی) گونجاوە لەگەڵ ڕەوشی کوردستان تاوەکو پەیڕەو بکرێت؟**

* هەر ولاتو کۆمەلگایەك، پەیوەستە بە کۆمەلێك کەلتوورو جیهانبینیو پێکهاتەی دەروونی جیاواز، بۆیە کۆپیکردنی سیستەمێكو هێنانی بۆ کۆمەلگەو ولاتێکی دیکە، پراکتیزەکردنی وەکو خۆی، لایەنی نەرێنییەکەی، زۆر زیاترە لە ئەرێنی، چجای ئەوەی کە ئەم دوو کۆمەلگەیە، لە ڕووی کەلتووریو جوگرافیو شارستانیو ئایینیو پێشکەوتنەوە زۆر لێك دوورن، کۆمەلگەی سویدیو کوردی، بە هەموو پێوەرێك دوو جیهانی زۆر لێك جیاوازن، بۆیە چۆن ناکرێ سیستەمی خوێندنی کوردستان، لەوێ دەقاودەق کۆپی بکرێ هاوکات بە پێچەوانەش هەر ڕاستە، بەلام دەکرێ سوود لە ئەزموونی سیستەمی سویدی وەربگیرێتو بگونجێندرێت لەگەڵ کۆمەلگەی کوردیو سیستەمی خوێندنی هەرێمی کوردستان.

**تەکنەلۆژیا لە ولاتانی ئەوروپا ڕۆلی بەرچاوی هەبووە، لە گەشەپێدانی ئاستی خوێندنو داهێنان، ئایا لە هەرێمی کوردستان ئەو ڕۆلە ئیجابیەی هەبووە؟ چۆن؟**

* بواری تەکنەلۆژیا بە هەموو سێکتەرو لقە جیاوازیەکانی بایەخێکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیە لە پێشخستنو ئاسانکاری لە ڕەوشی خوێندنو پەرەپێدانی زانستدا، پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا شۆڕشێکی چەندایەتیو چۆنایەتیی بەرچاو، لە ولاتانی تەکنەلۆژیو پێشکەوتوو بەدیهێناوە، لەم چواچێوەیەدا توانراوە خزمەتێکی گەورە بە بواری بەرەو پێشبردنی ئاستی خوێندن بکەن، بەداخەوە تەکنەلۆژیا وێڕای ئەوەی درەنگ وەخت گەیشتە کۆمەلگەی ئێمەو درەنگتریش کەوتە بواری پرۆسەی خوێندنەوە، بەلام ڕۆلێك پۆزەتیڤی ئەوتۆی نەبووە، واتە: نەمانتوانیوە بەباشی لێی بەهرەمەند بین، هەرچەندە هەندێك سوودی لێوەرگیراوە بە تایبەتی لە بواری تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەرو گەیاندن، بەلام ئەمە سەرجەم بوارەکان نییەو تەکنەلۆژیا زۆر زیاتر دەتوانێت، خزمەت بە بواری خوێندن بکات وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین.

**- ئایا قوتابخانەو زانکۆکانی کەرتی تایبەت چ ڕۆلێکیان هەبووە لە بەرەو پێشبردنی سیستەمی خوێندن لە کوردستان؟**

* هەلسەنگاندنی ڕۆلو بایەخی هەر بوارێك بە بەرهەمو کاریگەرییەکانی دەپێورێت، ئەوەی من ئەمڕۆ لە بواری کەرتی تایبەتیی خوێندن بە سەرجەم قۆناغەکانی دەیبینم، زیاتر وەکو کەرتێکی بزنس دەبینرێ لەوەی کە هەولێکی چڕی ئەکادیمیو زانستی بێت بۆ پێشڤەچوونی ئاستی پرۆسەی خوێندن. بەداخەوە، زۆرێك لەو زانکۆو قوتابخانە ئەهلییانە، نەك هەر نەیانتوانیوە ئاستی زانستیی کەرتی حکومی تێبپەڕێنن، بەلکو ئاستیان لە خوارتریشە؛ چونکە وەکو وتم؛ ئەوان زیاتر وەکو بازرگانیی بیر لە

ئا: ئاڤان سارمەمی

خوێندن دەکەنــەوە. واتە: خوێندن بە پلەی دووەم دێت، بۆیە ئەرکێکی گرنگــە، کــە وەزارەتی پەروەردەو خوێندنی بــاڵا، چاودێریی ئەم کەرتە بکاتو هەوڵی بەرزکردنەوەی کوالێتی ئەم ناوەندانە بدەن.

**- سەرباری ئەو هەموو زانکۆوپەیمانگا ئەهلیو حکومیانە کەچی هێشتا بەشێکی زۆری قوتابی وەرنەگیراوە، کێ بەرپرسە لەم دۆخە؟**

بەڕاســتی زۆریی قوتابیو وەرنەگیرانیان لە زانکۆو پەیمانگان، ئەمە کێشەیەکی بەردەوامە لە هەموو جیهان، نابێت ئەو ڕاستییەمان لەبیــر بچێت، لە هەموو سیســتەمەکانی خوێندنی جیهاندا، هەموو قوتابییەك وەرناگیرێت؛ چونکە خوێندن قۆناغەو هەموو قۆناغێکیش ئاســتی زانســتی خۆی دەوێت، مەرج نییە ئــەوەی قۆناغی ئامادەیی تەواوکرد، شایســتەی ئەوەبێت بچێتە زانکۆو پەیمانگا؛ چونکە ئەوە قۆناغێکی باڵاترە، هەروەها مەرج نییە ئەوەی دبلۆمو بەکالۆریۆســی بەدەســت هێنــا، بتوانێت ماســتەرو دکتۆرا بخوێنێــت؛ چونکە هەر قۆناغەو توانستی زانستیی خۆی دەوێت، هەروەها زۆری وەرنەگیرانی قوتابیش بەڵگەی ڕووتێکردنی ژمارەیەکی زۆریی هاوڵاتییە بۆ بواری خوێندنو فێرکردن، ئەوەش نیشــانەیەکی باشــی پێشکەوتنی بواری کۆمەڵایەتییە، بۆیە گرنگە حکومەتی هەرێم، تەنها بایەخ بە زانکۆو پەیمانــگاکان نــەدات، بەڵکو ئەو قوتابیانەی کــە وەرناگیرێن، هەوڵ بدا لە بواری خوێندنی پیشەییو دەستی کاری ناوخۆدا، سوودیان لێ وەربگیرێــت؛ چونکە کۆمەڵگەو وڵات تەنیا پێویســتی بە دەرچووی زانکۆو پەیمانگا نییە، بەڵکو بوارەکانی دیکەی پێویستە.

**قوتابییەك (١٦)ســاڵ دەخوێنێــت، دواتر تەخەروج دەکات، بــەڵام وەکو پێویســت، زانســتی وای پــێ نییە، ئایــا هۆکارەکەی مامۆستایە، یان قوتابی، یان خێزانە؟**

مامۆســتاو قوتابیو میتــۆدی خوێندن بنچینەی سیســتەمی خوێندن پێك دەهێنن، هەر کەموکوڕییەك لە یەکێك لەم کۆڵەکانە، کاریگەریی ڕاســتەوخۆی لەســەر کــۆی سیســتەمەکە دەبێت، وەکو ئاماژەمــان پێــدا میتــۆدی خوێندنی وڵاتی ئێمە کۆنەو بۆ ســاڵانی زوو دەگەڕێتــەوە، هاوکات مامۆســتاش کە پــەروەردەی ئەم ژینگەو میتــۆدەی خوێندنەیــە، ئەویــش لــە چوارچێوەیەکی قاڵبــدراودا ئاســتی خوێندنی بڕیوە، ئەمە جگە لەوەی ئێمە هەمیشــە لە شەڕو کارەساتدا ژیاوینو تووشی دابڕانی زانستیو مەعریفی بووین لەگەڵ جیهانی پێشــکەوتووی دەرەوەدا، ئەمەش وای کردووە مامۆستا خۆی تازە بکاتەوە بە زانســتو میتۆدی نوێو بیرکردنەوەی سەردەمیانە، قوتابیش دیســان کە بەرهەمی ئەم دۆخە ناسروشتییەی سیستەمی خوێنــدنو کۆمەڵگــەو خێزانە، ئەویــش بارگاوی بــووە بەم دۆخە وێــڕای ئەمانــە بەداخــەوە قوتابی لــە کۆمەڵگەی ئێمــە، هێندەی مەرامــی بەدەســتهێنانی بڕوانامەیــە، ئەوەندە خەمــی فێربوونی زانســتو پەرەپێدانــی مەعریفی خــۆی نییە، ئــەوەش هەڵەیەکی گەورەیە؛ چونکە تەیاربوون بە پســپۆڕیو زانســتی، هیچ کار ناکاتە ســەر بەدەســتهێنانی بڕوانامە، بەڵکــو دەرفەتی زیاتــر بۆ قوتابی دەڕەخسێنێت، کە کاری باشترو ئیمتیازاتی چاکتر بەدەست بهێنێت. بەداخــەوە، ســەرقاڵبوونی بــە هەندێ بــواری لاوەکییــەوە؛ وەکو: مۆبایلو فەیســبووكو ڤایبەرو پرۆگرامەکانی TVی ....هتد، قوتابی لە ئەرکە ســەرەکییەکەی دوورخســتووەتەوە، وای کردووە کە بایەخ بە کرۆکی زانســتو پســپۆڕیی خۆی نەداتو تەنیــا خەریکی حەزە کاتییەکانی بێت، ئەمەش لە دەرەنجامدا زیانێکی زۆری لێ دەکات.

**- دانەمەزراندنــی قوتابیــان، پێــت وانییــە وای کردبێ قوتابی ڕەشبینانە سەیری دوا ڕۆژی خۆیان بکەنو بڕوایان بە خوێندن نەمێنێت؟**

وەك چۆن ڕوودانی کارێــكو بابەتێك لە ڕابوردوودا، پاڵنەرێکی بەهێــزە بۆئــەوەی هەوڵ بدرێت لــە داهاتوودا دووبــارە بکرێتەوە کە پۆزەتیــڤ بــوو کارەکــە، یاخود هەوڵــی نەمانی بدرێــت، ئەگەر کارو بابەتەکە نێگەتیڤ بوو، هاوکات داهاتووش مۆتیڤێکی بەهێزە؛ بۆئەوەی ئێســتا هەوڵو کۆششی جددی بۆ بدرێت، پرۆسەی خوێندنیش یەکێکە لە پرۆســەی ناسكو هەستیارەکان؛ چونکە پەیوەستە بە بیرو هەستو ماندووبوونی ڕۆحیو جەستەییەوە، بۆیە قوتابی کە ئەم پرۆسە قورسە تێدەپەڕێنێت، کاتێك کە دەبینێت ئایندەیەکی گەش چاوەڕوانی دەکات، ڕەنگــە زیاتر کۆشــش بۆ زانســتو خوێندنەکەی بکات، بــەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت، کە داهاتوو بۆ هەموو ئەو قوتابیانە مسۆگەرە، کــە چالاكو پڕچەکن بە زانســتو لێوەشــاوەن لە پســپۆڕی خۆیاندا، بۆیە ئەگەر هەندێك ئاســۆی ئایندە تەمومژ بوو، نابێت قوتابی ســارد بکاتــەوە، بەڵکو دەبێت زێتر هانی بدات، کە خۆی ماندوو بکاتو خۆی بسەلمێنێت، تا کەسایەتیی زانستی خۆی بە جوانی دیاری بکات، هاوکات هەمــوو قوتابییەك لــە زۆرینەی وڵاتانی جیهانــدا، دامەزراندنو کاری مســۆگەریان بۆ دەستەبەر نەکراوە، بەڵام هەر بەردەوامن لە خوێندنو زانستو فێربوونو کار، پێوەری ڕاستەقینەن بۆ داهاتوویەکی گەش.

**ئایــا ئەو قەیرانە داراییەو ئەو جەنگە نەگریســەی بەرۆکی هەرێمی کوردستانی گرتووە، کاری لەسەر ڕەوشی خوێندن کردووە؟**

بەدڵنیاییــەوە ئەم قەیرانە داراییــە، کاریگەری خراپی هەیە لەسەر گشت سێکتەرەکانی ژیانی هەرێمی کوردستان، لەو نێوەندەشدا پرۆســەی خوێنــدن زیانی بەرچــاوی بەردەکەوێــت؛ چونکە وەکو هێمامان بۆ کرد، خوێندن پرۆسیســێکە پەیوەســتە بەلایەنی هزرو هەســتو ڕۆحەوە، ئەم قەیرانەش ئەم لایەنانەی قوتابیو مامۆستاو هاوڵاتیشــی بــارگاوی کردووەو مانــدووی کردووە، دیارە هەســتو بیرو ڕۆحی مرۆڤیش کە شــەکەت بــوو، بێگومان توانای وەرگرتنو فێربوونی کەم دەبێتەوە، مامۆســتاش ڕەنگــە بەهۆی ماندووبوونی بیرو هەســتو دەروونییەوە، وەکو پێویســت زانستەکە نەگەیەنێت بــە قوتابــی، بەڵام نابێت ئــەوە لەیــاد بکرێت، کە ئــەم قەیرانە کاتییەو تێدەپەڕێت، ئەوەی نابێت بەئاسانی خۆی بەدەستەوە بدەن تێپەڕبوونــی کاتــە بێ فێربوون، دەبێت قوتابــی هەوڵ بدات بیرو هەســتو ڕۆحی لەوە گەورەتر بێت کە ئەم قەیرانە سســتی بکاتو لــە هەوڵەکانی دوای بخات؛ چونکە قەیرانەکە هەر کۆتایی پێدێت، بەڵام پێویستی ژیان بۆ فێربوونو زانست هەر بەردەوامە.

**چارەســەری ئەو بارودۆخەی خوێندن چییەو چی بکرێت؟ چارەسەر لای کێیە؟**

بۆ چارەســەرکردنی هەر قەیرانو گرفتێك، دەبێت لە سەرەتاوە ئەو فاکتەرانە چارەســەر بکەین، کــە بوونەتە هۆی زەقبوونەوەی ئەو کێشــانە، وەکو لە پێشــدا ئاماژەمان بۆکرد، سیستەمی خوێندن لەسەر سێ کوچکە وەستاوە، کە ئەویش مامۆستاو قوتابیو میتۆدی خوێندنە، دەبێت کۆنفراسێکی زانستی پرۆفیشناڵ بۆ هەر یەکێ لەم سێ کوچکەیە ببەسترێت، بە هاوکاری پسپۆڕانی دەرەوە، پاشان وەکو نەخشەڕێگەیەك وەزارەتــی پەروەردەو خوێندنی باڵا، ڕێنماییو بڕیارو گۆڕانکارییەکانی ئەم کۆنفرانسە جێبەجێ بکرێت، هاوکات دەبێت حکومەتی هەرێمیش، هاوکاری جددیو پێویســتی ئەم کۆنفرانســەو گۆڕانــکاریو ڕیفۆرمی ڕیشــەیی لە ڕووی ماددیو مەعنەوییەوە بکات؛ چونکە تا سیســتەمی خوێنــدن لە وڵاتــی ئێمەدا، تەندرووســتو زانســتیو موتوربەکراوی بەروبوومی پێشــکەوتووی سیســتەمی خوێندنی وڵاتانی سەرکەوتووی ئەو بوارە نەبێت، ئێمە ئاســتەمە هەنگاوی باش بەرەو پێشەوە بنێین، ژاپۆن کە ئەمڕۆ چووەتە ســەرتۆپی جیهان لــە تەکنەلۆژیاو داهێنان، بەرهەمی سیستەمێکی پێشــکەوتووی خوێندنە، بۆیە تا ڕۆژێ زووتر، ئــەم هەنگاوە بنێین، هێشــتا درەنگــە؛ چونکــە داهاتوویەکی گەشو کۆمەڵگەیەکی پێشــکەوتوو، بەرهەمی کاری جددیو پلان بۆدارێژراوی ئەمڕۆیە، بۆیە تا هەوڵ بۆ ڕیفۆرمی ڕیشــەیی لە پرۆســەی خوێندن نەدرێت، من گەشبین نیم کە داهاتویەکی گەش چاوەڕوانمان بکات.

# چەمکی کارگێڕیی ئەلکترۆنی

# E-Management

ئا: هۆگر محەممەد



## چەمکی کارگێڕیی ئەلکترۆنی [1]

**E-Management چەمکی کارگێڕیی ئەلکترۆنی، چەمکێکی زانستیو سەردەمییە لە بواری زانستی کارگێڕی[2]**، لە ژینگەی ئێستای جیهاندا لە ڕاستیدا ئینتەرنێت کە سەپێنراوە[3]، یاخود پرۆسەیەکە کە کارگێڕی پێی هەڵدەستێت بە توانایەکی زیاتر لەسەر ئینتەرنێتو تۆڕەکانی کار لە پلاندانانو ئاڕاستەکردنو چاودێریکردنی دەرامەتو ناوەرۆکی توانا بێسنوورەکان لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکان[4].

بەڕای هەندێك نووسەر، کارگێڕیی ئەلیکترونی چەمکێکی سەردەمیانەیە. کە دیاردەیەکە لە ئەنجامی شۆڕشی زانیاریو پەیوەندییەکانەوە هاتۆتەکایەوە، بەهۆی گوزەرانی باشی مرۆڤەکان، بەتایبەتی دوای دەرکەوتنی چەمکی ئابووری ژمارەی (الاقتصاد الرقمي)و لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە کەئەم هاتنەکایەی ئەم چەمکەو بەکارهێنانی بوو لە نێو کەرتی گشتیو کەرتی تایبەت، تەنها دواتر چەند ناوێكو چەمکێك دیارکەوتن، وەك کارگێڕیی ئەلیکترۆنیو حکومەتی ئەلیکترۆنیو حکومەتی زیرەك.

بەڕای هەندێك توێژەریش، کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، بریتییە لە: " چەترێکی گەورە کە وا لقو پۆپی هەیەو بواری جێبەجێکردنی جیاوازە، وەك بازرگانیی ئەلیکترۆنی (E-Commerce) [5]، کارە ئەلیکترۆنییەکان (E-Business)، هەروەها حکومەتی ئەلیکترۆنی (E-Government)، دواتر بوو بە شێوەیەکی

---

١- E-Management: واتا کارگێڕی ئەلیکترۆنی کە کورتکراوەی Electronic Management

٢- إيهاب فاروق مصباح العاجز، دور ثقافة التنظيمية في تفعيل تطبيق الإدارية الكترونية، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة الاسلامية - غزة، ٢٠١١، ص(٣٨)

٣-د.خالد حيدر عبد على (الحكومة الاكترونية)، مجلة الاقتصاد السياسى، ژ(١١)، ٢٠٠٦، ص١٣٧

٤- نجم عبود، الادارة الالكترونية: الاستراتيجية والوظائف و المشكلات، ط١ دار المريخ، الرياض، ٢٠٠٤، ص ١٣٧.

٥- شائع بن سعد مبارك القحطاني، مجالات ومتطلباتو معوقات تطبيق الادارة الكترونية في السجون، رسالة الماجستير (غير منشورة) جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض - السعودية، ٢٠٠٦، ص٩.

گشتگیرترو تەواوتر کە کارگێڕیی ئەلیکترۆنییە.

- توانای ڕێکخراوی (گشتیو تایبەت) بۆ بەرەو پێشبردنی خزمەتگوزارییەکانو گواستنەوەی زانیارییەکان بە ئامرازی ئەلیکترۆنی، وەکو تۆڕی ئینتەرنێت، یان هەر تۆڕێکی پەیوەندییە ئەلیکترۆنییەکان لە نێوانیانو لە نێوان هاونیشتیمانیانو ئەو ڕێکخراوی کارانەی کەوا مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، بەسووکیو بەئاسانیو بەنایابترینو وردبینیو بەکەمترین تێچوو، کەمترین کات لەگەڵ دابینکردنو دەستەبەرکردنی تایبەتمەندێتیی پاراستنی ئەمنییەتی زانیارییەکان لەهەر کاتو شوێنێك[٦].

- پرۆسەیەکی کارگێڕییە، بنیادنراوە لەسەر توانستی زۆری ڕوونی ئینتەرنێتو تۆڕەکانی کارکردن لە پلاندانانو ئاڕاستەکردنو چاودێریکردنی سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان بەبێ سنوور لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە[٧].

- شکاندنی بەربەستەکانی کاتو شوێنە لە ناوخۆو دەرەوەی ڕێکخراو بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکانو ئەمەش بە لکاندنی تەکنەلۆژیای زانیارییەکان بەشێوەیەکی پڕبایەخەوە دەزگاو ئامرازەکانی میری بەرپرسیاردەبن لە پابەندبوونیان بە بەردەوامبوونیانو بەرەوپێشبردنیان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆ گشت چالاکییەکانو ئاسانکردنی ڕێوشوێنەکان (الاجراءات)و تەواوکردنی مامەڵەکانیان بەشێوەیەکی خێراو کارامە[٨]، یاخود سیستەمی کارەکانو چالاکییەکانە، کە تەواوکەرو جێبەجێکارەکەی ئەلیکترۆنیاتەوە لەسەر تۆڕەکان.

- کارگێڕیی ئەلیکترونی چەند ناساندنێکی جیاوازی هەیە لەوانە: سیستەمێکی تەکنیکیو پیشەیی تەواوە لەجیاتی کارگێڕیی کلاسیکی (لاسایی)و داڕشتنی سیستەمێکە کە بگۆڕێت بۆ نەخشەی ڕێکخستنی ڕێکخراو، یان پەیکەری ڕێکخستی ڕێکخراو، یان بەڕێوەبردنی سەرچاوەی زانیارییەکانە لە ڕێگەی تۆڕەکان بەشێوەیەکی گشتیو بەشێوەیەکی تایبەتی لە سەر ئینتەرنێت.

- کردارێکی کارگێڕییە بەهێزە لەسەر زیادکردنی تواناکان لەڕێگای ئینتەرنێتو تۆڕەکانی کار لەبواری پلاندانانو ئاڕاستەکردنو چاودێریکردن لەسەر سەرچاوەکانو ناوەڕۆکی توانای ڕێکخراو[٩]، بەچاودێریش دەگوترێت: چاودێریی ئەلیکترۆنی، کەمترین لادانی کارگێڕی دەبێت، کەوابوو کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، گۆڕانێکی ڕێکخستنەوەیە، لە پەیکەری ڕێکخستنی ڕێکخراو، لە کارگێڕیی کلاسیکییەوە، بۆ کارگێڕیی ئەلیکترۆنی؛ لە ڕێگای بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێو سەردەمیانەوە، وەك هێڵکاریی ژمارە (١) لە خوارەوە، کە گۆڕانی کارگێڕیی کلاسیك، بۆ کارگێڕیی ئەلیکترۆنی ڕوون دەکاتەوە لە ڕێگەی ئامرازەکانی تێپەڕبوونی کات.

پشتێنەی ئامرازەکان
پشتێنەی زانیاریەکان
کارگێری کلاسیك
کارگێری ئەلکترۆنی
لە کۆن
لە داهاتوو
پێشکەوتن بەرەو کارگێری ئەلیکترۆنی

هێڵکاری (١) إیهاب فاروق مصباح العاجز ، دور الثقافة التنظيمية في تفعيل تطبيق الإدارة الإلكترونية ، الرسالة الماجستير (غير منشورة)جامعة الاسلامية – غزة ، فلسطين ، ٢٠١١ ، ص(٢٨)

٦- سعيد معلا العمري، المتطلبات الادارة والامنية لتطبيق الادارة الالكترونية، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة نايف للعلوم الامنية، الرياض – المملكة العربية السعودية، ٢٠٠٣، ص١٦.

٧- نجم عبود، نفس المصدر السابق، ص١٢٧.

٨- شائع بن سعد مبارك القحطاني، نفس المصدر السابق، ص١٠.

٩- محمد جمال اكرم عمار، مدى إمكانية تطبيق الإدارية الإلكترونية، رسالة ماجستير(غيرمنشورة) جامعة الاسلامية، غزة - فلسطين ٢٠٠٩، ص(٢٩)

- کارگێڕی ئەلیکترۆنی، بریتییە لە: " درێژکردنەوەی قوتابخانە کارگێڕییەکان، کە تێپەڕیون لە ڕابوردوودا؛ هەروەك کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، گەیشتۆتە لووتکەی قۆناغەکانی بەرەوپێشچوونی کارگێڕی (بە سەرکەوتنی بەسەر ئەو کارگێڕییەی کە لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوودا هەبوو).

کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، بریتییە لە درێژبوونەوەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای کارگێڕی: لە سەرەتادا ئامادەکردنی ئامێرەکانی شوێنی کارمەندانو پلاندارشتنو چاودێریکردنی بەیارمەتیی کۆمپیوتەر، دواتر دەبێت هەوڵ بدەین، کاربکەین لەسەر ئینتەرنێتو تۆڕەکانی کار لە هەمان تەکنەلۆژیا زۆر دەبێت لە قۆناغە مێژووییەکانی مامەڵەکردنی کارگێڕی لەگەڵ تەکنەلۆژیا، یاخود کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، بریتییە لە: بەرئەنجامی پێشکەوتنی ئاڵوگۆڕی داتا ئەلیکترۆنییەکان، وەك لە بواری پسپۆڕیو وردو بەرتەسك، یاخود کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، کارلێکی نێوان مرۆڤەکانو ئامێرەکانە: لە پیشووتردا کێشەیەك هەبوو، کە بریتی بوو لە چۆنێتیی بەرەنگاربوونەوەو بەرهەڵستیکردنی پێبەندیی (قیود) ڕێکخستنەکانو جوگرافیو هونەری، کەوا کارلێکی مرۆڤەکانی سنووردار کردبوو، دووری دەخستەوە لە پەیوەندی، بەڵام لەگەڵ ئینتەرنێتو تۆڕەکانی کار، توانی کارلێك بکاتو ماوەکانو بۆشاییەکانی ڕێکخستو جوگرافیو هونەریو کاتەکان نزیك بکاتەوە[١٠].

لە تەواوی ئەم پێناسەو بۆچوونانەی توێژەران بۆ کارگێڕیی ئەلیکترۆنی، دەگەین بە پێناسەیەکی هاوبەش بۆ کارگێڕیی ئەلیکترۆنی کە بریتییە لە " پرۆگرامی بەڕێوەبردنێکی نوێ، کە هەڵچنراوەو بە هۆشیارییەوە تەکنەلۆژیاکانو زانیارییەکانو پەیوەنییەکان بەکاری دەهێننو کاریان پێ دەکەن بۆ ئەنجامدانی پیشەی سەرەکییو بنچینەییەکانی کارگێڕی، لە ڕێکخراوەکانی ئەم سەردەمی جیهانگیرییەو گۆڕانکارییە بەردەوامەکان[١١].

## سەرچاوەکان:

- علي السلمي، خواطر في الإدارة المعاصرة، دار غريب للطباعة والنشر والتوزيع – القاهرة، ط١، ٢٠٠١.

- نجم عبود، الإدارة الالكترونية: الاستراتيجية والوظائف والمشكلات، ط١ دار المريخ، الرياض، ٢٠٠٤.

- خالد حيدر عبد على (الحكومة الاكترونية)، مجلة الاقتصاد السياسي، ر (١١)، ٢٠٠٦

- إيهاب فاروق مصباح العاجز، دور ثقافة التنظيمية في تفعيل تطبيق الإدارية الكترونية، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة الإسلامية - غزة، ٢٠١١

- شائع بن سعد مبارك القحطاني، مجالات ومتطلبات ومعوقات تطبيق الإدارة الالكترونية في السجون، رسالة الماجستير (غير منشورة) جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية، الرياض - السعودية، ٢٠٠٦، ص٩.

- سعيد معلا العمري، المتطلبات الإدارة والأمنية لتطبيق الإدارة الالكترونية، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة نايف للعلوم الإمنية، الرياض – المملكة العربية السعودية ، ٢٠٠٣، ص١٦.

- محمد جمال أكرم عمار، مدى إمكانية تطبيق الإدارية الإلكترونية، رسالة ماجستير(غيرمنشورة) جامعة الاسلامية، غزة - فلسطين ٢٠٠٩

- رحاب حسين جواد كاظم، ١٢/٣ /٢٠١٤: http://www.uobabylon.edu.iq/uobColeges/lecture.aspx?fid=9&lcid=42393

١٠- شائع بن سعد مبارك القحطاني، نفس المصدر السابق، ص١١.

١١- على السلمي، خواطر في الإدارة المعاصرة، دار غريب للطباعةو لنشر والتوزيع – القاهرة، ط١، ٢٠٠١، ص٣٢٣. انظر // رحاب حسين جواد كاظم، ١٢/٣ /٢٠١٤: http://www.uobabylon.edu.iq/uobColeges/lecture.aspx?fid=9&lcid=42393

ن: د. عبدالكريم بكار

و: حسێن نەجمەدین قەرەداغی

# گەشەپێدانی تەواوکاری

## بەشی چوارەمو کۆتایی



ئەو بەشەی کە زۆرتر مەبەستمانە لەبارەیەوە بدوێین، پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان خۆیانە، کە ئێستا هەموومان شاهیدی ئەوەین، کە بەهۆی تێکچوونی ئەم هاوسەنگییەوە، چۆن ئاڵۆزی رووی لە مرۆڤایەتی کردووە.

ئەو رایەڵو پەیوەندییە کۆمەڵاتییەی کە مرۆڤەکان پێکەوە دەبەستێت، یەکێکە لە سەرچاوەکانی بەختەوەری، ئەگەر بە زانستییانە ئاراستە بکرێتو بخرێتە خزمەتی ئاسوودەیی مرۆڤەکانەوە، بەشێکی زانایان بۆچوونیان وایە، ئەمە هەستی زۆربەمانە، ***کاتێك منداڵ بووین، وامان دەزانی سەرچاوەی بەختەوەری، لە بوونو وەرگرتندایە، بەڵام کە گەورە بووین، ئەوەمان لا روون بووەوە، کە بەختەوەری لە بە خشیندایە.***
هەروەها کاتێك منداڵ بووین، وامان دەزانی بەخشین تەنها بەخشینیماڵو دارایییە، بەڵام کە گەورەبووین، ئەوەمان لا روون بووەوە، کە بە خشینی راستەقینە، بریتییە لە: بەخشینی سۆزو گرنگیدانو لێبووردەییو بەخشینی بیری نوێو دیدو تێڕوانینی بەسوودو ئامانجدار، ئەم بنەمایانە سێ پایەی هەیەو تەواوی مەبەستەکەی لەسەر دادەمەزرێتو دەتوانین بڵێین هەریەکی (٣٣،٣٣٪)ی بەردەکەوێت؛ بۆئەوەی مرۆڤەکان پلەی تەواو بەدەستبهێنن:

١- كف الأذى: دوورکەوتنەوە لە ئازاردانو تەنگپێهەڵچنین، ئەمە کەمترین شتە، کە مرۆڤ پێشکەش بە هاوتا مرۆڤەکەی دەکات، سەرنج بدە پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ )، لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ )، بەشێکی زۆری ئەو گرفتانە لە هاوڕەگەزو هاوژینەکانمانەوە پێمان دەگات، ئەمەش نیشاندەری ئەو راستییەن، کە پەروەردەیەکی لاوازو ناتەندرووستو نەتوانینی خۆ کونترۆڵکردن بوونی هەیە، هەر ئەمەش وای کردووە، بە هەزاران گەنجو لاو، ئالوودەی مادده هۆشبەرەکان ببنو تواناو لێهاتووییەکانیان بەفیڕۆ برواتو ببنە بارێکی گرانیو قورسی، بەسەر حکومەتو کۆمەڵگاوە.

٢- بەخشینو هاوکاری دارایی (ماددی):

ژیان بەبێ دابینکردنی پێداویستییە داراییەکان، ئەستەم بەڕێوە دەبرێت، بەتایبەت لەم رۆژگارەی ئەمڕۆدا، کە بەرەو ئەوە دەچین شتی خۆراییو خزمەتی گشتی نامێنێتو کەرتی تایبەت شوێنی ئەو خزمەتانە دەگرێتەوە، ئەمەش کاریگەریی روونو بەرچاو، لەسەر بەشێکی کۆمەڵگە دادەنێت، بەتایبەت چینە لاوازو کەم دەستەکە، کە هەمیشە، پێویستییان بە هاوکاریو پشتیوانیی کەرتی گشتیو بە شێوازی بێبەرامبەر، یان نرخێکی کەمو رەمزی هەیە، لێرەدا پێویستە گەشە بە هەستی مرۆڤبوونو بەخشینی بێبەرامبەر لای تاکەکانی کۆمەڵگە زیاتر بکەین.

هەرچەندە دەزانین دەستەبەرکردنی پێداویستیی مرۆڤەکانو تۆمارکردنی هاوبەشی کۆمەڵایەتی بە سیستەمو یاسادانی تایبەت دەبێت، بەڵام هەموو ئەمانەش کەموکووڕی تێدا دەبێت لە سەر ئەرزی واقیعو لە کاتی جێبەجێکردندا، کە ناتوانێت هەموو پێداویستییەکان پڕ بکاتەوە، ئەو ناتەواوییانە بە کاری خێرخوازیو مرۆڤدۆستی پڕ دەکرێنەوە، ئەگەر مرۆڤ لەبارو گوزەرانێکی وادابوو، کە نەیدەتوانی شتی گەورە ببەخشێت، دەبێت راهێنان بکات، خۆی لەسەر بەخشینی شتی بچووك رابهێنێت، بەڵام دیارە ئەویش بەشێوازی مۆدێرنو زانستی، کە لە هەموو بارەکاندا، هەستی مرۆڤانەی بەخشەرو سوودمەندان پارێزراو بێت.

٣- بەخشینی مەعنەوی (هەستوسۆز):

بازنەی ئەم جۆرە لە بەخشین، زۆر گەورەو فراوانە، زۆریش گرنگە، دوو جۆر مرۆڤ، کە هەموو مرۆڤایەتی خۆی بە قەرزاری دەزانێت، ئەوانیش (پێغەمبەرانو پاشان دایکان)، دایك دارایی نابەخشێت، بەڵکو سۆزو هەستو گرنگی پێدانو بەخشینێکی ئارامو پشوو درێژو بێبەرامبەر دەبەخشێت، لەبەرئەوەیە هەموو مرۆڤەکان بە شانازییەوە باسی رۆڵی دایکیان دەکەن، جا لە هەر پلەو مەقامێکدا بن.

بەخشینی پێغەمبەرانیش، بەخشینی مەعنەویو رێپیشاندانو بێبەرامبەرو بەردەوامە، کە بەدرێژایی مێژوو، بۆ خزمەتو تەواوکاری مرۆڤەکان بووە.

لە کۆتاییدا دەڵێین هەمووومان لەو کەرەسەو کەلوپەلانەمان هەیە، لە خۆگرتنەوە لە ئازاردانی مرۆڤەکانو ماددیو مەعنەوی، بەڵام لاوازی لە رێکخستنو پێشکەشکردنیدا هەیە. بۆیە پێویستمان بە دووبارە خوێندنەوەی ئەو ئەرکو پێداویستییانەو رێکخستنەوەیان لە پێشەوەی کارە هەرە گرنگەکانە، هەموو ئەمانەش لە پێناوی مرۆڤسالاریو مرۆڤدۆستیدا دەبێت.

• سەرچاوە: سوود لە پێگەی (د.عبدالكريم بكار) وەرگیراوە.

# زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی

ئا: محەممەد هاشم محەممەد ..... بەشی سێیەم




زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتیو مەرجەکانی تەسلیم (INCOTERMS٢٠١٠)

(مصطلحات التجارة الدولية) پێکدێت لەمانەی خوارەوە:




| EXW – Ex Works -١<br>تەسلیمکردنی کەرەستەکان لەناو کارگەو کۆگاکانی فرۆشیار لە وڵاتی خۆی (شوێنەکە دیاری کراوە) | |
|---|---|
| **ئەرك‌و بەرپرسیارێتیی فرۆشیار** | **ئەرك‌و بەرپرسیارێتیی کڕیار** |
| ١- ئامادەکردنی کەرەستەکان بۆ بارکردن لەناو کارگەو کۆگاکانی خۆی، بەرپرسیاریش نییە لە بارکردن.<br>٢- بەرپرسیار نییە لە دەربازکردنی کەرەستەکان بۆ هەناردەکردنو (دڵنیایی)کردنی.<br>٣- کەمترین بەرپرسیارێتی دەبێت. | ١- بەرپرسیارێتیی وەرگرتنی کەرەستەکانو بارکردنی بۆناو ئەو سەیارەیەی کەرەستەکان دەگوازێتەوە، دابینکردنو هێنانی سەیارە بۆ گواستنەوەی کەرەستەکان.<br>٢- بەرپرسیار دەبێت لە گواستنەوەو هەموو ئەو خەرجیو مەترسیو تێچووانەی کە دێتە سەر کەرەستەکان لە کارگەی فرۆشیارەوە، تاکو شوێنی دیاریکراو بۆ وڵاتی کڕیار.<br>٣- باشتر وایە کڕیار کەرەستەکان (تأمین) دڵنیایی بۆ بکات، لە هەر سێ قۆناغەکان، تا دەگاتە ناو کۆگاکانی خۆی.<br>٤- زۆرترین بەرپرسیارێتی دەبێت.<br>٥- بەرپرسیار دەبێت لە دەربازکردنی کەرەستەکان بۆ هەناردەکردنو دڵنیاییکردنی لە وڵاتی فرۆشیارو لەناو وڵاتی خۆیو بەرپرسیاری گشت تێچووەکان. |

**EXW: ExWorks**

فرۆشیار

کڕیار





SELLER

BUYER

| Seller/ Exporter Named Place | Export Documents, Formalities, and Fees | Pre-Carriage to Named Place, Not Unloaded | Delivery at Named Place/Port, Unloaded | Loading at Named Place/Port of Shipment | Loaded On Board Ship or Vessel | Transport by Air, Rail, Road, Water, or Multimodal | On Board Ship or Vessel, Not Unloaded | Discharging (unloading) at Named Place/Port of Destination | Delivery at Named Place/ Terminal | Onward Carriage to Named Place, Not Unloaded | Import Documents, Formalities, and Duties | Buyer/ Importer Named Place, Unloaded |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| CARRIAGE | | | | | | | | | | | | |
| RISKS | | | | | | | | | | | | |
| COSTS | | | | | | | | | | | | |

Incoterms 2010

# فێڵی بازرگانی

وەهاب حەسیب

به هۆی زۆریی کاڵاو شمەکی بازرگانیو ڕکابەری له نێوان خاوەن بەرهەمەکاندا، هەوڵدان بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان له بازاڕەکانی دنیادا، چەندین جۆر فێڵو گزیی بازرگانیو فریودان پەیدابوون، لەوانە له بەرگرتنەوەی (کۆپی) بەرهەمی ڕاستەقینە، سپیکردنەوەی دراو، ڕاکردنو خۆدزینەوە له باجو ... هتد.

به شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، کاریگەریی خراپیان لەسەر ئابووریو بازاڕی وڵاتانو تەندرووستیی هاوڵاتیان هەیە، هەروەها هۆکارەکانی شاردنەوە، پێچو پەنا (تدلیس)، کۆششکردن بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزیی به شێوەیەکی ناڕەوا، کارێکه به هۆی فێڵی بازرگانییەوە، ڕۆژ له دوای ڕۆژ له زیادبووندایە، هاوکات پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو تەکنیك به شێوەیەکی خێرا یارمەتیی ئەم دیاردەیە دەدات.

**مەبەست له فێڵی بازرگانی،** تێکدانو گۆڕانو دەستکاریکردنی پێکهاتەی سرووشتی مادەیەك، یان کاڵایەکی ئامادەکراوە، شاردنەوەی تایبەتمەندییە خراپەکانیو به دەستهێنانی جیاوازیی نرخو سوودی زیاترە.

**فێڵ له زمانەوانییدا** بریتییە له: پیشاندانی شتێك که له ڕاستیدا بەو شێوەیە نەبێت، یاخود تێکەڵکردنی باشو خراپە.

**فێڵ له بواری یاساییدا:** هەموو کارێکی ئامانجدارە له بەرهەمهێنانی بەرهەمێکدا، به شێوەیەك پێچەوانەی ئەو بنەماو یاساییانە، یاخود ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندییانە بێت، که بەرهەمەکەی لەسەر بنیات دەنرێت، یاخود له قازانجکردنی بەهەرمو خزمەتگوزارییەکەدا ڕەچاو دەکرێت، به مەرجێك لایەنێکی دیکەی مامەڵەکە پێی نەزانێت، لایەنەکه کەسێك، یان دەستەیەك، یان دەزگایەك، یان حکومەتێك بێت.

**هۆکارەکانی فێڵی بازرگانی:**

١. هەبوونی کەلێنی گەورە له یاساو ڕێساکانو ئامرازەکانی چاودێریدا، که پشت به لایەنێکی وردی زانستیو هونەری دەبەستێت.

٢. نەبوونی هۆشیاری به مافو بەرپرسیارێتیی بەکاربەر، بەشداریکردنی هەموو ئەو لایەنانەی که پەیوەندییان بەو کارەوە هەیە، لەوانە کۆمەڵگای مەدەنی، به تایبەت کۆمەڵەی داکۆکیکەر لەمافی بەکاربەرو له ژینگە، که چاودێریو پارێزگاری بەکاربەر دەکەن، هەڵبەت «له ڕوانگەی بەکاربەرەوە».

٣. هەڵکشانی نرخی زۆرێك له شمەكو کاڵاکان، لەوانە خواردنو دەرمان، که هۆکارن بۆ فێڵو شاردنەوە، ئاوڕدانەوەی بەکاربەر له شمەکی کۆپیکراو، به تایبەت پۆشاك، پێڵاوو جانتاو... هتد.

به تایبەت ئەو مارکانەی که ناوبانگی جیهانیان هەیە،

وا دەكات بازرگان قازانج بكات، ئەگەر بەشێوەیەكی یاساغیش بێت.

٤. نەبوونـی تاقیگـە، كادرو هونەری پسـپۆڕ كە خاوەن تایبەتمەندیو پێوانەیی تایبەت بن، ئەو كارە بەسەر دەزگای پشـكنینو چاودێریـدا جێبەجـێ دەكرێت، بـە تایبەت لە ناوخۆی وڵاتدا.

## دیاردەكانی فریودان:

**فریـودان لـە بواری كڕینو فرۆشـتندا:** بـە زۆری ئەم دیاردەیە لە بازاڕدا دەبینرێت، فێڵەكە لە خودی شـمەكەكە، ڕەگەزەكانـی، پێكهاكەتەی، كێشو سـەرچاوەكەیدا دەكرێت. لەوانە بازاڕی میوە، یاخود سـەوزەو وشكەمەنی زۆربەی كات فرۆشـیار بەشە جوانەكەی لەسـەرەوە دادەنێتو دەیكات بە ڕووكاری فرۆشراوەكەی، بەشە خراپەكەشی دەشارێتەوە، ئەو كارە پێچەوانەی دینو ئاكارو نەریتو یاسایە.

یاخـود لە كاتی هەرزانیو داكشـانی بـازاڕدا بازرگانێك، یاخود سـەرمایەدارێك شـمەكێك، یان كاڵایەك دەكرێتو لە ڕۆژگاری گرانییدا بە هیوای قازانجی زۆر دەیخاتە بازاڕەوە.

لـە ڕۆژگاری ئـەوڕۆدا جۆرەهـا بـواری دیكـەی كاڵاو خزمەتگوزاری فێڵیان تێدا دەكرێت، لەوانە كوالێتی (باشێتی)، نرخو بەكارهێنانی نیشانەی بازرگانیو... هتد.

بەشـێوەیەك ئـەم دیاردەیـە ئەمـڕۆ لـە جیهاندا بە (800$) ملیـار دەخەمڵێنرێت، كە دەكاتــە (٧٪) بازرگانی جیهانی، زۆربەی وڵاتانو ڕێكخراوەكان ساڵانە قەبارەو زیانی ئەم بازرگانییە یاساخە پیشانی گشت لایەك دەدەن، تا هەموو لایەك هەست بە مەترسیو دەرهاویشتە خراپەكانی بكات.

**بـواری خواردن بـە نموونـە،** لێكۆڵینەوەیەك كە (مارك وۆلف) لە بواری خواردنداو لە وڵاتی بەریتانیادا كردوویەتی، ئەوەی پیشـانداوە كە (١٠٪)ی بازرگانیی خۆراك لەو وڵاتەدا فێڵـی تێدا دەكرێـت، بڕەكەی دەگاتــە (٧٠) ملیار جونەیهی ئوسـتەرلینی. لە ڕاپۆرتێكی (دەسـتەی خۆراكی بەریتانیدا) هاتووە: تەنها (٥٤٪) برنجی (بەسمەتی) كە لە بازاڕەكانی ئەو وڵاتەدان برنجی بەسمەتی ڕاستەقینەن.

بواری دەرمان، سـاڵی (٢٠١٠)، پشكی فێڵو لەبەرگرتنەوە (كۆپـی) لـەو بازرگانییەدا بـە (75$) ملیـار خەمڵێنراوە، لێكۆڵینەوەكە ئەوەی ئاشـكرا كـردووە، كە (٣٠٪) دەرمان لە وڵاتە تازە پێگەیشـتووەكاندا سـاختەكاری تێدا دەكرێت كە (١٠٪) ئابووری ئەو وڵاتانە پێكدەهێنێت.

لـە وڵاتـە پێشـكەوتووەكاندا كە خـاوەن تەكنەلۆژیای پێشـكەوتوون، كرێـكاری لێهاتوو چاودێـری كاران، دەرمانی ساختە كەمتر لە (١٪) ڕێژەی بازرگانییان پێكدەهێنێت.

لـە كۆڕێكـدا، بەڕێوەبەرێتـی باجی وڵاتی (سـعودیە)، ئەوەی ئاشكرا كرد كە قەبارەی بازرگانیی ساختە لەو وڵاتەدا (٤١) ملیار ڕیاڵی سعودی بووە.

لە هەرێمی كوردسـتاندا هیچ ئامـارو داتایەكی فەرمیو باوەڕپێكراو لەبەردەسـتدا نییە، تـا ئەنجامە خراپەكانی بۆ هەموو لایەك پیشـان بدرێت، بەشـێوەیەكی گشتی دەتوانین بڵێین: پشـكی گەورەی بازرگانی لە كوردستاندا ئەو بەرهەمو خزمەتگوزارییـە یاسـاغانەن كە ڕێگە پێ نـەدراون. (كنەو پشكنینی ئەم كارە بۆ خوێنەر بە جێدەهێڵم).

## كاریگەریی فێڵی بازرگانی لەسەر دەوڵەت:

فێڵـی بازرگانـی هـۆكاری لاوازیی ئابووریـی وڵاتە، ئەو كەسو لایەنانەی لەم بوارەدا كار دەكەن پێناسـێكو بوونێكی یاسـاییان نییە، ئەو كەسو لایەنانە بەشێوەیەكی یاساغ دزە دەكەنە ناو ئەم كارەوەو بە شـێوەیەكی نایاسایی كارەكانیان ڕادەپەڕێنن.

بەرهەمـی سـاختە بەشـێوەیەك زیـان بـە بەكاربـەر دەگەیەنێت، جاری واهەیە تووشـی شـێواوی جەستە، یاخود گیان لە دەستدانی دەكات.

بە نموونە ساڵانە لە وڵاتانی (سـعودیە) پێنج هەزار كەس بە هۆی ڕووداوی هاتووچۆوە گیان لە دەست دەدەن، كە زۆرێكیـان هۆكارەكەی كۆپی پێچكـە (تایە)ی ئۆتۆمبێلەكانە كە لەو ڕووداوانەدا ڕۆڵی سەرەكی دەبینن.

## كاریگەریی فێڵی بازرگانی لەسەر گەلان:

لـە هەندێ وڵاتاندا پێشـكەوتنی تەكنیـكو تەكنەلۆژیا كارێكـی كردووە، بەرهەمـی كۆپیكراوو گزیـی بازرگانی بە شـێوەیەكی خێرا گەشـە بكاتو پێش بكەوێـت، ئەو كەسو لایەنانەی ئەم بەرهەمانە درووست دەكەن، لە درووستكردنو هەناردەكردنی بەرهەمەكانیان ئاسـتەنگێكیان بۆ درووسـت نەبێـتو بە بەرهەمی ڕاسـتەقینە بیفرۆشـن. بـۆ نموونە لێكۆڵینەوەیـەك ئاماژە بۆ ئەوە دەكات لە وڵاتی نایجیریا لە (٨٠٪) ئەو دەرمانانەی بەسەر دەرمانخانەكاندا دابەشدەكرێت كۆپیكـراون، لـە وڵاتی هنـد (١٥ ـ ٢٠٪) دەرمانـی كۆپیكراو دەسـتی بەسـەر بازاڕەكانی ئەو وڵاتەدا گرتووە كە بە (1$) ملیار دۆلار دەخەمڵێنرێت.

لـە كۆتاییـدا دەڵێین: فێڵی بازرگانی دەسـتدرێژییەكی ڕاسـتەوخۆیە بـۆ سـەر خەڵك، چونكـە چاوبەسـتەكێیان لەگەڵـدا دەكرێـت، لە بری ئـەوەی بەرهەمی ڕاستەقینەو بـاش هەڵبژێـرن، بەرهەمی خراپو كۆپیكراویـان بۆ دابین دەكرێت، بە دیوێكی دیكەدا دەسـتدرێژیكردنە بۆ سەر مافی خاوەندارێتـی كۆمپانیـاو دامەزراوەكان، كەسـەكانو خاوەن نیشـانەی بازرگانییەكان، چونكە ئەوان كۆشـشو پارەیەكی زۆریـان خەرج كردووە، تـا بەرهەمەكانیان بەو شـێوەیەی مەبەستیانە بگات بە دەسـتی بەكاربەر. بەشێوەیەكی گشتی كارەكـە دژ بە هەمـوو ئایینە ئاسـمانییەكانو هەموو دنیاو ویژدانێكی زیندووە.



برِیاری منداڵان

و: لە فارسییەوە:
هەورامان محەممەد

# هەمیشە شێر بن

تائێستا بیرتان لەوە کردۆتەوە بۆچی بە "شێر" دەڵێن پادشای دارستان؟! لە کاتێکدا کە:

نە بە هێندەی گۆریلا جەستەی بەهێزە
نە بازووی وەکوو بازووی ورچ بەهێزە
نە خێراییەکەی وەکو خێرایی پڵنگە
نەبازدانو هەڵبەزینەوەی وەکوو ئاسکە
نە درندەییەکەی وەکوو درندەیی گورگە
نە بە هێندەی کەمتیار نەوسنو چڵێسە
نە بە هێندەی ڕێوی فێڵبازە
نە......................ئاوایە!

**چ شتێك بۆتە هۆی ئەم ناونیشانە بۆ شێر؟!**

شێر بە هۆی چەند تایبەتمەندییەك کە لە هەڵسووکەوتیدایە پێی دەڵێن "پادشای دارستان" چونکە:

شێر، تا برسی نەبێت، ڕاو ناکات (درندەخوو نییە)!

لە کاتی برسێتیدا بە هێندەی پێویستی خۆی هەڵدەبژێرێت، نەك زیاد لە پێویست (تەماعباز نییە)!

لە نێوان ئاژەڵاندا ڕاوی بەهێزترینیان دەکات (لاوازکوژ نییە)!

لە نێوان ئاژەڵاندا مێیە سکپڕەکان هەڵنابژێرێت، (سۆزو بەزەیی هەیە)!

دوای ڕاو سەرەتا خۆی لێی ناخوات (لەخۆبردووە)

ئەو خواردنەی کە لێی دەمێنێتەوە هەرگیز نایشارێتەوەو دووری ناخاتەوە لە گیاندارەکانی دیکە (چاوپۆشیکەرو نانبدەیە)!

لە کاتی پیریو نەخۆشیدا لە ڕەوەکەی جیا دەبێتەوە، تا هەراسانیان نەکات......

کەوابوو هەمیشە شێربن.



رۆشنبیری تەندروستی!






# هەوکردنی ڤایرۆسیی جگەر

# VIRAL HEPATITIS LIVER

**١- ناساندنی نەخۆشییەکەو هۆکارەکانی:**

نەخۆشـییەکی بەربـڵاوەو بەهـۆی کۆمەڵێـك ڤایرۆسـەوە ڕوو دەدات، کـە هێرش دەبەنە سـەر خانەکانی جگەر، تووشـی هەوکردنو دارمانی دەکەن. جگە لە ڤایرۆسـەکان هۆکاری تریش هەیـە، لەوانـە: خواردنەوەی کهـوول، بڕێکی زۆر لـە دەرمانی پاراسیتامۆڵو هەندێك ژەهر، مشەخۆرو کەڕوو.

ڤایرۆسـەکانی جگـەر چەنـد جۆرێکن، تاکو ئێسـتا ئەمانە دۆزراونەتەوە:

- ڤایرۆسی جۆری ئەی (HAV): زۆرتر لەنێو منداڵاندا بڵاوە، لەڕێی پیسـایی کەسی تووشبووەوە دەگوازرێتەوە بۆ کەسێکی تر، ئەگەر خواردنێك، یان ئاوێك بخوات پیسبووبێت بەپیسایی کەسی تووشبوو، یان لە ڕێی چڵکی ژێر نینۆك، یان هەرشتێکی پیسبووی تر کە ڤایرۆسەکەی لەخۆگرتووە.

- ڤایرۆسی بی (HBV): مەترسـیدارترین جۆری ڤایرۆسـە کەتووشـی مـرۆڤ دەبێت لە تەمەنـە جیاوازەکانـدا، ئەم جۆرە گەورەترین هۆکاری شێرپەنجەی جگەرە. ئەم ڤایرۆسە لە هەموو شـلەکانی لە شـی تووشـبوودا هەیە وەك (خوێن، لیك، فرمێسك، میزو شـلەی تۆواوی پیاو)، بۆیە دەگوازرێتەوە بۆ کەسـێکی تر لە ڕێی گواسـتنەوەی خوێنو پێکهاتەکانـی، لە دەمەوە بۆدەم بەهۆی لیکەوە، پەیوەندیی سێکسـی، بەکارهێنانی دەرزیی پیسبوو، تاتۆو خاڵکوتان، گوێ سـمین، بەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان کاتێك دەرزیـی یەکتر بەکاردەهێنن، هەروەها دایـك ئەتوانێ بۆ منداڵی بگوازێتەوە لە کاتی منداڵبووندا‌و پاشانیش لە ڕێی شیرەوە.

- ڤایرۆسی سی (HCV): یەکێکە لە مەترسـیدارترین ڤایرۆسەکانی جگـەر، بەپێی ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهانـی (WHO) لە نێو تووشـبووان بەم ڤایرۆسـەدا، (٨٠٪)یان سەردەکێشـنی بـۆ هەوکردنی درێژخایەنـی جگـەر (Chronic Hepatitis)و (٢٠٪)یان تووشـی دارزانـی جگـەر دەبـن، لەئەنجامدا (٥٪)یـان پاش دە سـاڵی داهاتوو تووشـی شـێرپەنجەی جگـەر دەبـن. ئەم ڤایرۆسـە یەکـەم هۆکاری هەوکردنـی درێژخایەنـی جگەرە لە ئەمریکادا، بەداخەوە ڕێژەکەشـی لـە زیادبوونێکـی ترسـناکدایە لـە وڵاتانـی خۆماندا‌و وڵاتی میسـر زیادترین بڵاوبوونەوەی ئەم ڤایرۆسـە هەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەم ڤایرۆسـەش بەهەمان ئەو ڕێگەیانـە دەگوازرێتەوە، کە جۆری بی پێدەگوازرێتەوە.

- ڤایرۆسی دی (HDV): ئەم ڤایرۆسە تەنها توانای هێرشکردنە سـەر ئەو کەسـانەی هەیە کە تووشـبوون بە جۆری (بی)شیان هەیە، بەهەمان ڕێگەی جۆری بی دەگوازرێتەوە.

- ڤایرۆسی ئی (HEV): زۆر لـە جـۆری (ئەی)دەچێـت، لـە ڕێگـەی خـۆراكو ئـاوی پیـس بـووەوە دەگوازرێتـەوە. جۆری (ئەی)و (ئی) لە کۆتاییدا ئاسـاییدەبنەوەو کاریگەرییەکی وا بەجێناهێڵـن مەگـەر بەدەگمـەن، بەڵام جـۆری (ئی) ئەگەر تووشـی ئافرەتـی دووگیان ببێت، ئەوا ڕێـژەی مردنی منداڵەکە بەرزدەبێتەوە بۆ (٢٠٪).

- ڤایرۆسی جی (HGV): ساڵی ١٩٩٦ دۆزراوەتەوەو پەیوەندییەکی زۆری هەیە لەگەڵ نەخۆشـییە بەهێزو درێژخایەنەکانی جگەر، ئەمیش لە ڕێی خوێنو پێکهاتەکانییەوە دەگوازرێتەوە.

**٢- گرنگترین نیشانەکانی تووشبوون بەم ڤایرۆسانە:**

- زەردوویی.
- گەورەبوونی جگەرو ئازار لە کاتی دەست لێداندا.
- نەمانـی ئـارەزووی خواردن بەتایبەت بـۆ چاو جگەرە لە کەسی جگەرەکێشدا.
- سکچوونو ڕشانەوە.
- تاریکبوونی ڕەنگی میزو کاڵبوونەوەی ڕەنگی پیسایی.

**٣. هەڵگری ڤایرۆسکە (Virus Carrier) کێیە؟:** ئەو کەسەیە تووشی یەکێك لە جۆرەکانی (بی)، یان (سی)، یان (دی) بووبێت، نیشانەکانی نەخۆشـییەکەی لێدەرنەکەوتبێت، بەڵام ڤایرۆسەکە لەلەشدا دەمێنێتەوەو دەگوازرێتەوە بۆ کەسێکی دیکە. دەتوانرێت کەسی هەڵگر بناسرێتەوە لە ڕێی پشکنینی تایبەتی خوێنەوە.

**٤. چۆن خۆمان بپارێزین؟:**

- هەرگیز زیاد لە جارێك هیچ دەرزییەك بەکار مەهێنە.
- پێویستە ئەو کەسـەی خوێن دەبەخشێت، پشکنینی وردی بۆبکرێت پێش وەرگرتنو گواستنەوەی خوێنەکە.

کوتـان لـە دژی ڤایرۆسـی (بـی) بەتایبەت بـۆ (منداڵانی تازەلەدایکبـوو، ئەو پزیشـكو تیمـە تەندروسـتیانەی لەگەڵ نەخۆشـی جۆراوجۆر مامەڵە دەکەن، دەرزیی دان لەو کەسـانەی تـری هەمـان مـاڵ کـە تووشـبوویەکیان هەیـە، هەروەها ئەو کەسانەی پێویسـتیان بەخوێن پێبەخشینی بەردەوام هەیە وەك ئەوانەی نەخۆشـیی کەمخوێنییـان هەیە، یـان ئەوانەی چەند جارێك پێویستیان بە شـۆردنی گورچیلە هەیە، هەرکەسێکی تر کە پیشەکەی تێکەڵبوونی لەگەڵ خەڵك زۆر تێدایە.

ن: د. حسان شمسی پاشا --------- و: یەحیا محەممەد عەلی

# سوودەکانی بەزالیا



بەزالیای سەوز، یەکێکە لە پڕ بەهاترین سەوزەمەنییەکان لە ڕووی بەهای خۆراکییەوە، ژمارەیەکی زۆر ئاوێتەی خۆراکی گرنگو سوودبەخشی بۆ لەشی مرۆڤ تێدایە، دەوڵەمەندە بە ئاوێتە کاربۆهیدراتەکانو ڤیتامینەکانو کانزاو پرۆتینو ریشاڵەکان، وەك ڤیتامینەکانی (مەنگەنیز، توتیا، ئاسن، مەگنیسیۆم، پۆتاسیۆم، ڤیتامین (K ، A، C ، B)و پرۆتینو ریشاڵی خۆراکی تێدایە.

سوودەکانی

**یەکەم:** دابەزاندنی کێش یەکێك لە گرنگترینی سوودەکانێتی، بوونی بڕێکی زۆری ریشاڵە خۆراکییەکانو لەگەڵیدا کەمی یەکەی گەرمییە، ریشاڵەکان وا دەکەن هەست بە تێری بکەیت بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەمەش وا دەکات بەسوود بێت بۆ ئەوانەی کێشی خۆیان دادەبەزێنن.

**دووەم:** پاراستنی لە شێرپەنجەی گەدە بەزالیا بڕێکی باش لە ئاوێتەکانی "پۆلیفینۆل" کە بە کۆمیسترول ناودەبرێت تێدایە، بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە لە مەکسیك کراوە ئەو ئاوێتەیە، گەدە لە شێرپەنجە دەپارێزێت.

**سێیەم:** بەهێزکردنی بەرگری لەش، بوونی بڕێکی باشی دژەئۆکسانەکان لە بەزالیادا، لەش لە زۆرێك لە نەخۆشییەکان دەپارێزێت، سەرەڕای بوونی ئەو کانزایانەی بەرگری لەش بەهێز دەکەن، گرنگترینی ئەو ئاوێتەی بەسوودانەی بۆ بەرگری لەش لە بەزالیادا هەن، بریتین لە: فلاڤونویدات: کاتشینو ئیبیکاتشین کارۆتینەکان، ترشە فینۆلیەکانی وەك ترشی کافییکو ترشی فیرۆلیك. کانزاکانی وەك (توتیا، ئاسن، مەگنیسیۆم، کالیسیۆم، مس).

**چوارەم:** پاراستن لەو نەخۆشییانەی بەهۆی هەوکردنەوە پەیدا دەبن، خواردنی بەزالیای سەوز، یارمەتیی پاراستن لەو نەخۆشییانە دەدات، کە بە هۆی هەوکردنەوە درووست دەبن، وەك هەوکردنی جومگەکانو زەهایمەر، لەبەرئەوەی بڕێکی زۆری لە دژەهەوکردنەکانی تێدایە.

**پێنجەم:** ڕێکخستنی شەکری خوێن، سوودێکی تری بەزالیا ڕێکخستنی شەکری ناوخوێنە، بەهۆی بوونی ریشاڵە خۆراکییەکانو پرۆتین تێیدا یارمەتیی هێواش مژینی شەکر دەدەن.

**شەشەم:** پاراستن لە نەخۆشییەکانی دڵ، دژەئۆکسانەکانی ناو پێکهاتەی بەزالیا سوودی هەیە لە پاراستن لە نەخۆشییەکانی دڵو بۆرییەکانی خوێن، یارمەتیدەرە بۆ ڕێگری لە هەوکردنی دیواری بۆرییەکانی خوێن.

**حەوتەم:** پاراستن لە قەبزی، ریشاڵەکانی یارمەتیی ڕێگری لە قەبزبوون دەدەنو لەو نەخۆشیانەی پەیوەندییان بە کۆئەندامی هەرسەوە هەیە دەپارێزێت. سەرەڕای بەسوودبوونی بۆ ژنی دووگیان بەهۆی بوونی دژەهەوکردنو دژە ئۆکسانەکانەوە.

**هەشتەم:** نزمکردنەوەی کۆلیسترۆڵی ناوخوێن، نیاسین یەکێکە لە ڤیتامین (B) کە لە بەزالیادا هەیە یارمەتیی کەمکردنەوەی بەرهەمهاتنی کۆلیسترۆڵی زیانبەخشو چەوری دەدات، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی کۆلیسترۆڵی ناو خوێنو چەورییە سیانییەکان.

**نۆیەم:** بەهێزکردنی چاو بەزالیا دژەئۆکسانی بەسوودی بۆ تەندرووستی چاو هەیە وەك ( لوتینو کارۆتینەکانو زاکسینو ڤیتامین (A)).

**دەیەم:** سوودی بۆ پێستو قژ لەبەرئەوەی ڤیتامین (C) تێدایە بۆ پێست بەسوودە سەرەڕای بوونی چەند ئاوێتەیەك تێیدا، هەروەها بۆ بەهێزبوونو گەشەی قژ بەسوودە بەهۆی ڤیتامین (C ، A).

**یانزەیەم:** بەهێزبوونی ئێسکەکان بوونی ڤیتامین (K) لە بەزالیادا یارمەتیی بەستنەوەی کالیسیۆم لە ئێسکەکان دەدات، هەروەها ڤیتامین (B) یارمەتیی ئێسکەکان دەداتو لە لاوازبوون دەیانپارێزێت.

# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## مانگی شەش



هەر مانگێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە.. مانگی (٦)یش وەك هەر مانگێکی دیکە خاوەنی تایبەتمەندیو خەسڵەتی تایبەت بە خۆیەتی، واتە: ئەو کەسانەی لە مانگی حوزەیراندا هاتوونەتە دونیا، خاوەنی کۆمەڵێك سیفەتیو ئەرێنیو نەرێنین، کە ڕەنگە لە هەندێك سیفەتدا لە مانگەکانی دیکەی وەرزی بەهاردا هاوبەش بنو لە هەندێ سیفاتی دیکەشدا جیاواز بن. لەم ژمارەیەدا باس لەسیفەتە ئەرێنیو نەرێنییەکانی ئەو کەسانە دەکەین، کە لە حوزەیراندا چاویان بە ژیان هەڵهێناوە، بێگومان هەروەکو لە ژمارەکانی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کرد، لێرەشدا دووبارە یادتان دەهێنینەوە، هەڵسەنگاندنەکان لە ئەنجامی توێژینەوەو تاقیکردنەوەی چەندین کەسەوە بووە لەلایەن دروونناسو توێژەرەوانەوە، دواتر گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام مەرج نییە هەڵسەنگاندنەکان لە سەدا لە سەد بن، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی ئەو سیفاتانەن، ڕەنگە هەندێك کەس لەم مانگەدا لەدایکبوو بن، بەڵام پێچەوانەی ئەم سیفەتانەش بن..

**کەواتە: بەشێوەیەکی گشتی سیفاتی ئەرێنی ئەو کەسانەی لە مانگی حوزەیراندا لەدایکبوون، بە گشتی لەم خاڵانەدا چڕبوونەتەوە:**

١- خاوەنی بیرۆکەو بیرکردنەوەیەکی دوورمەودان، واتە: کەسانێکی دووربینن.

٢- کەسانێکی ئاکاربەرزو ڕەوشتجوانو لە قسەکردندا هێمنو لەسەرخۆن.

٣- بیرۆکە گەلێکی زۆریان لەلا گەڵاڵە بووە، واتە: هەمیشە خاوەن بیرۆکەی جوانو ناوازەن.

٤- کەسانێکی ژیربێژن، هەمیشە حەز بە کاری باشترو چاکتر دەکەن.

٥- لەسەر شێوەو شێوازی خۆیان دەردەکەون. واتە: حەز بە سرووشتی خۆیان دەکەنو حەز بە تەمسیلو دەمامککردن ناکەن.

٦- دڵخۆشو شادومانو کەیفخۆشو ڕۆحسووکن.

٧- کەسانێکی سوعبەتچیو قسەخۆشن.

٨- گفتوگۆکارێکی لێهاتوون.

٩- حەز بە خەونی زیندوو واتە: واقیعی دەکەن.

١٠- کەسانێکی بەسۆزو میهرەبانن.

١١- بە ئاسانی دەتوانن هاوڕێو کەسانی دڵسۆز دەست بخەن.

١٢- کەسانێکی جێگیرو دامەزراون.

١٣- بە ئاسانی کەسایەتیان دەردەکەوێت، واتە: غامزنین.

١٤- حەز بە شیکپۆشیو خۆڕێکخستن دەکەن.

١٥- خاوەنی ژیرییەکی ناوازەن.

١٦- کەسانێکی ئیدارییین.

**سیفاتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی شەشدا لە دایکبوون:**

١- زۆر بە ئاسانی بەبەخشینەکان کاریگەر دەبێت.

٢- کەسانێکی هەستیارن.

٣- بە هۆی سەرقاڵییانەوە مێشکیان پەرتو بڵاوە.

٤- دوودڵو ڕاڕان، واتە: ناتوانن بە ئاسانی بڕیار بدەن..

٥- هەمیشە حەز دەکەن کارەکانیان دوابخەن.

٦- زۆربڵێن، واتە: زۆر حەز بە قسەکردن دەکەن.

٧- زۆر بەئاسانی بریندار دەبن.

٨- زۆر دووچاری هەڵامەتو کۆکەو سەرما دەبن.

٩- جاروبار کەسانێکی بێزارو وەڕەس دەردەکەون

١٠- زۆر گرنگی بە ڕواڵەتیان دەدەن.

١١- زۆر بەدەگمەن سۆزو خۆشەویستییان دەردەبڕن.

١٢- پێویستیان بە کاتێکی زۆر هەیە، تا ئازاو ناڕەحەتییەکان تێدەپەڕێنن..

١٣- کەسێکی ئینکارو کەللەڕەقە.

١٤- خاوەنی بەرنامەیەکن کە هاوڕێکانی لە خۆی دەکاتە دوژمنو دوژمنەکانیشی لە خۆی دەکاتە دۆست!

خۆشەویستان گەر سەنج بدەین دەبینین، سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی شەشدا هاتوونەتە دونیاوە، نزیکن لە ژمارەی سیفەتە ئەرێنییەکانیان.. هەرچەندە ژمارەی سیفەتە ئەرێنییەکانیشیان زۆرنو سیفات گەلێکی ناوازەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدانو ماندووبوونی زیاتر پێویستە لەسەر ئەو خوشكو برا بەڕێزانە لەم مانگەدا لە دایکبوون؛ بۆئەوەی سیفاتە نەرێنییەکان لە خۆیان داڕنو بە سیفاتی ئەرێنی زیاتر خۆیان بڕازێننەوە.

شەهێن حسێن

# نامەیەک بۆ بابە

نامەوێت بڵێم لە دوای تۆ ژیانمان خراپ شێوا، چونکە ئەوە جۆرێکە لە گلەییکردن لەو بەشەی کە پەروەردگار پێی داین، تەنها دەڵێم لە دوای تۆ ئیتر نە ماڵەکەی جاران بوو، نە ئەوانەی کە تێیدا دەژیان وەك جاران مان. دەزانین کە تۆ ژیانت کردە قوربانی بۆ ئاسوودەییو خۆشگوزەرانی ئێمە. من دەزانم گەر بە دەست خۆت بوایە، هەرگیز جێت نەدەهێشتین، چونکە تۆ تەنانەت لە دواساتەکانی تەمەنیشتدا هەر لە خەمی ئەوەدا بوویت کە دوای خۆت کێ خەمخۆرو سەرپەرشتو پارێزگارمان بێت. زۆر سەیرە هیچ کات ئەوە بە خەیاڵماندا نەدەهات، کە ڕۆژێك بێت بەجێمان بهێڵیت، تەنانەت خەونیشمان نەدەبینی بە ڕووداوێکی لەو جۆرەوە...

پێشبینی ئەوەمان هەرگیز نەکردبوو، کە بگەین بە ڕۆژگارێك کە هەموو ئێوارانێك چاو لەدەرگا ببڕین، سا بەڵکو تۆ بیکەیتەوەو وەك جاران بگەڕێیتەوە ناومان، بەڵام ئەم خەیاڵو چاوەڕوانییەش بێسوود بوو، چونکە تۆ هەرگیز نایەیتەوە، ئەگەر جارێکی تر دەگەڕایتەوە، ئەوا لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە بە تاسەوە بەرەو ڕووت ڕام دەکردو دەهاتم بۆ پێشوازیتو لە ئامێزم دەگرتیت، بەبێئەوەی شەرمنی ڕێگەم پێ بگرێت، هاوارم دەکردو دەموت خۆشم ئەوێی بابەگیان، چیتر نەم ئەهێشت جارێکی تر بەجێمان بهێڵیت، هەرچییەك لە ناخمدا کەڵەکە بوو، پێم دەوتیت. بە ئارامیو بەبێ ترس، ئیتر چی ڕوو دەدات، با ڕوو بدات، ئەم جارە ئەو سۆزەی لە ناخمدایە بۆت، نەمدەشاردەوەو لە جیاتی زمانم دڵم دەهێنایە گفتوگۆ لەگەڵتدا، هەرچی گلەییەکم لێت هەیە پێم دەوتیت.

ئاخۆ دەبێت تۆ ئێستا ئێمەت لە بیربێت؟ من دڵنیام هەرگیز لە یادمان ناکەیت، سەیرە لام کاتێك خەو دەبینم، هەمیشە لە خەونەکانمدا دێیتەوە لامان، هەروەك ئەوەی لە سەفەرێك گەڕابیتەوە. دیارە تۆش دەزانی هێندە تامەزرۆی گەڕانەوەتین، بۆیە دەڵێی با لانی کەم بە خەون بگەڕێمەوە ناویان. من نامەوێت ڕۆحی تۆ ئازار بدەم، هەرگیز گلەیی لە ڕۆیشتنت ناکەم، چونکە دەزانم ئەوەی کە تۆی بردەوە، ڕۆژێك دێت هەموومان دەباتەوە بۆ لای خۆی، من ئومێدی دووبارە بینینەوەی تۆم هیچ کات لەدەست نەداوە. دەزانم دەتبینمەوە نەك لە خەودا، بەڵکو بە ڕاستی دەتبینمەوە، دەبێت چ ساتێکی خەیاڵیو ئەفسووناوی بێت، ئەو کاتەی بە دیداری یەك دەگەینەوە، وا هەست دەکەم داروبەردو درەختو ئاسمانەکان لەگەڵماندا دەگرینو فرمێسکی شادی دەپرژێنن.. دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم کە ڕۆحت ئاسوودە بێت، من هیچ کات ئامۆژگارییەکانی تۆم لە یاد نەکردووە، گرنگی پێدانو خەمخۆریت هەمیشە لەبەرچاومە، تەنها بە داخم لەوەی کە نەمتوانی پێش ڕۆیشتنت پاداشتی چاکەو ماندووبوونەکانت بدەمەوە، هەر نەمتوانی ئەوە بکەم.

هەموومان بیرت دەکەین، تا ئەو ساتەی لە ژیاندا بوویت، نە تۆ بە ئێمەت وت، نە ئێمەش بە تۆمان وت، هەرچەندە درەنگە بەڵام هەر پێت دەڵێین: خۆشمان دەوێیت، هەست بە گرنگی بوونی تۆ دەکەین، لە ژیانماندا نەبوونت بۆشاییەکی گەورەی لە ماڵەکەماندا درووست کردووە، کە تا کۆتایی تەمەن پڕ نابێتەوە..

# لەگەڵ سەردەمدا بژین!

## ٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

### مۆمی ٣٤ بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

و: ئاسیا صەلاح

کـوڕو کچەکانم، گەر بڕوانینە ژیانـی باووباپیرانمان، ژیانی ئێستامان دەبینین، هەمیشە کەسـانێك چاکەکارنو کەسانێکیش خراپەکار، کەسـانێك پێداگرنو کەسـانێك شـلگیر، کەسـانێك دەبەخشـنو کەسـانێك دەبەن... هاوچەرخبـوون واتە: لە ڕۆحو ئەقڵی سەردەمەکەتان بگەن، پاشان هەوڵی گونجان بدەن لەگەڵ باشـترینیو چاکترینی ئـەوەی خەڵکەکەی هەیانـە. یەکێك لە دانایـان دەڵێت: "گـەر ڕۆحێکی هاوچەرخانـەت نەبێت، هەموو خراپەکارییەکانیت دەبێت." ئەمەش ڕاسـتو درووسـتە، ئەگەر کەسـێك نەزانـی ناو نەزانانو نارێکی نـاو نارێکانو هەژاری ناو هـەژارانو لاوازی نـاو لاوازان بێت.. لێرەدا کێشـەکە زۆر گەورە نییە، بەڵکو ئازیزانم، کێشەی گەورە لەوەدایە، کە مرۆڤ نەزانی نـاو زانایان بێتو لاوازی ناو بەهێـزان بێت... دەزانن دواتر چی ڕوو دەدات؟

ئەوکات هەموو کێشـەکان بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە، ئەمەش سـوننەتێکە لە سـوننەتەکانی خودای گەورە لە درووستکراواندا. ڕەنگە بپرسـن: ڕۆحی هاوچـەرخ چییە کە دەبێت خاوەنی بین، لێی تێبگەین، یاخود بسازێین لەگەڵیدا؟

منیـش دەڵێم: ڕۆحـی هاوچەرخ لەمانەی خـوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

ئەو ڕێساو نموونانەی کە پێکهاتەی درووستی تاكو کۆمەڵگەن، وەك ڕاسـتگۆییو ئەمانەتپارێـزیو وردیو هاریـکاری یەکتـرو تێگەشتن لە بارودۆخی کەسانی ترو بەردەوامیو کراوەیی.

بوونـی پاڵنـەری بەهێز کـە ئاڕاسـتەی خوڕەوشـتی هەر یەکێکتان دەکات بەرەو بەرزی، دەیکاتە خاوەن پەیامو هەمیشـە لەهەوڵـی گەیاندنیـدا دەبێـت بەخەڵکی، دەبێتە خـاوەن دیدو خواستە بەرزەکان بە هیوای بە دیهێنانیان.

ئامانجـی دیاریکراوو ڕوون بەپێی پرۆگرامـی ڕۆژانە، وا لە خاوەنەکەی دەکات هەسـت بە نزیکبوونەوەی بەردەوام بکات لەو ئامانجە.

فێربوونێکـی بـاش، ئەمەش لـە ڕێگەی بەشـداریکردن لە قوتابخانەو زانکۆی باشو هەوڵدان بۆ سەرکەوتن تێیدا، هەروەها لە ڕێگەی گرنگیدان بە بوارێك لە بوارەکانی زانسـت، تا ئاسـتی پێگەیشتن تێیدا.

ڕێکخستنی باری کەسێتیتو زیادترین سوودوەرگرتن لە کاتو پەیوەستبوون بە بەڵێنەکان لەپاڵ ئەمانەدا جەختکردنەوە لەسەر پاراستنی یاساو ڕێسا کارپێکراوەکان کە لە بەرژەوەندیی گشتیدان، کە یارمەتیدەرە بۆ خستنەڕووی ئەرکو پاراستنی مافەکان.

ئەو ڕۆحەی ئەم ڕێسـاو واتاو چەمکانە بەرجەسـتە دەکات، ڕۆحی کەسـانی پێشەواو سـەرکردەکانەو ئەو ڕۆحەیە کە کوڕو کچەکانمان پێویسـتیانە، تاکو بەدرووستیو کارایانە بژین. لێتان ناشـارمەوە هەر هەموو ئەو ڕێسـایانەی کە ئاماژەیان پێکرا، لە بناغەدا لە ڕێسـاکانی ئیسـلامن، کە بەداخێکی زۆرەوە، لەلایەن زۆرینەی موسوڵمانانەوە پشتگوێ خراون!

ئەو کەسـەی ئەم ڕۆحەی نەبێت کە ئاماژەی پێکرا، ڕەنگەلە یەکێك لە بوارەکاندا، سـەرکەوتنێکی خێـرا بەخۆیەوە ببینێت، بەڵام هەرگیز بەردەوامی نییە، ڕەنگە هەر ڕەواش نەبێت، دەبێتە کارەساتێك بۆ خاوەنەکەی!

**ئەمە چی دەگەیەنێت لای کچو کوڕەکانم:**

ئەم سەردەمەی ئێمە لێوانلێوە لە دەرفەتو گرفت، تا بتوانن ڕووبەڕووی گرفتەکانی ببنەوە، دەبێت دەرفەتەکانی بقۆزنەوە.

متمانەو ڕاستیو درووستیو بیرفراوانی، بناغەکانی فەرهەنگی ئەم سەردەمەن.

ئاگاداربن لەو هەڵە تێگەشـتنەی بەرامبـەر هاوچەرخبوون هەیە، کە زۆرینەی گەنجان بەرەو لادانی ئەخلاقی دەبات، تووشی لەدەستدانی یەکجاریان دەکات.

هەرگیـز ڕازی مەبن کەسـانی ئاسـایی بـن، هەوڵی چاکەو سـەرکەوتنو پێشـەوەی ڕیزەکان بدەن، لەڕێگەی پەیوەستبوون بەوەی پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

# ژیرانە ڕێ بکەو نەفرەت لە بەرزیو نزمیی ڕێگا مەکە

شڤان ئەحمەد

لەو ساتەی کە مرۆڤ، چاوەکانی بە دونیا هەڵدێنێتو دەست بە ژیان دەکات، لەو چرکە ساتە بە دوا، کاتژمێری تەمەنی دەست بە ژماردنی ڕۆژەکان دەکات، ئەو کات ژماردنەش مرۆڤ دەخاتە ژێر بەرپرسیارێتیەکی گەورەوە؛ چونکە لە داهاتودا پرسیاری لێدەکرێتو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، کە ئەو کاتەی کە پێی بەخشرا لە چیدا بەسەری برد، هەر یەکێك کە بەشداری ئەم ژیانەیە دەبێت بە شێوەیەك ژیابێ، کە وەڵامێکی دڵخۆشکەرو ڕزگارکەری پێبێت.

سرووشتی ژیان وایە، کە هەمیشە لەسەر بارودۆخێك جێگیر نابێت، ئەمەش تایبەتمەندیو کاریگەریی خۆی دەبێت بەسەر ژیانی هەر یەك لە ئێمەوە؛ چونکە هەر بارودۆخێك پێویستی بە جۆرە هەڵسوکەوتو ڕەفتارێك هەیە، کە تایبەتە بەو دۆخە. کەوابوو: لە سەر هەریەك لە ئێمە پێویستە ژیرانە ڕەفتار لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژانەیدا بکات، تاوەکو دڵەڕاوکێو ترس زاڵ نەبێت بەسەریدا.

کاتێك مرۆڤ ناخۆشییەك، یاخود بەڵایەکی بەسەردا دێت، دەبێت یەکسەر پەنا نەباتە بەر نەفرەتکردنو خۆقەڵسکردن، یاخود ناڕەزایی دەربڕین لەو شتەی تووشی بووە، بەڵکو سەرەتا دەبێت بزانرێت کە هۆکاری تووشبوونی بەم ناڕەحەتییە چییە؟ ئەی چارەسەر چییە؟ چونکە کاتێك دکتۆرەکان دەیانەوێت چارەسەر بدەن بە نەخۆشەکانیان، سەرەتا دەپرسن نەخۆشییەکەی چییەو لە هۆکارەکەی دەکۆڵنەوە، پاشان چارەسەری بۆ دادەنێن. کەوابوو: بۆ هەر ئاڵۆزیو پشێوییەك دەبێت ئەوە بزانرێت کە هۆکارەکەی چییەو دەبێت چی بکرێت، هەتا زیاتریش سەرقاڵ بین بە ناڕەزایەتی دەربڕینو ڕابوردووەوە، زیاتر کارەکانمان قورس دەبێ؛ چونکە هیچ کات دواخستی چارەسەر بۆ برین، کارێکی ژیرانە نییە.

کەوابوو: دەبێت هەنگاوەکانمان وردو ژیرانە بێت، بزانین چۆن دەژینو ئامانج لە ژیانو دروستکردنی ئەم گەردوونە پڕوردەکارییە چییە؟ ئەو کات ئاسانترو بێکێشەتر دەژین. خۆ ئەگەر ئاستەنگێکیشمان تووش ببێت، دەزانین چۆن بە ئاسانترینو چاکترین ڕێگا چاکسازی بکەین.

سەیری حاڵی خەڵکی بە گشتی بکەن؛ هەیانە ساغو تەندرووست، نەخۆشو داماو، دەوڵەمەندو هەژار، خاوەن پلەو پایەو ناودار، بێکەسو بێناو، زیرەكو لێهاتوو، کەم تواناو بێبەرهەم، هەموو ئەم جۆرانە لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بە ئاشکرا دەبینرێت، ئەمەش ڕاستیەك بە ئێمە دەڵێت؛ کە هەموو ئاستەکان لە تاقیکردنەوەدانو هەریەك بە جۆرێ تاقی دەکرێتەوە، جا قسەی ئێمە لەسەر ئەوەیە کە چۆن ژیرانە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەریەك لەو دۆخانە بکەین، بۆ نموونە کاتێك خودا توانایەکت پێ دەبەخشێت، دەبێت ئەوە بزانیت کە بەرپرسیارێتییەکی گەورەت لە سەرشانە، کە چۆن بەو لێهاتوییەت خزمەت دەکەیتو کارئاسانی بۆ ژیانی دەوروبەرت دەکەی، تا چەند سوپاسگوزاری ئەم بەخششەیت، بەپێچەوانەوە گەر توانای هیچت نییە، دیسان دەبێت سوپاسگوزار بیت، ئەوە بزانیت گەر لەم ڕووەوە بێبەشیت، ئەوا خاوەنی دەیان بەخشراوی تریت، کە هەزاران کەس لێی بێبەشن، بەڵام گرنگە هەستو دەروونت فێڵت لێ نەکەنو ڕووەو ناسوپاسگوزاری ئاڕاستەت نەکەن؛ چونکە زۆرێك لەم حاڵەتەدا تێدەکەونو بەهۆی داخستنی تەنها دەرگایەك لە ژیانیاندا، خۆیان تووشی هەڵدێرو بەهیلاکچوون دەکەن.

گەر ژیرانەو ئاقڵانە، مامەڵە لەگەڵ سەختیو ناخۆشییەکان، خۆشیو کامەرانییەکاندا بکەین، گەر نیعمەتو بەخششمان بەسەردا ڕژێنرا ئەوە سوپاسگوزار بینو دەوروبەرمانی لێ بێبەش نەکەین، خۆ ئەگەر ناخۆشیو بەڵایەکیش تووشمان بوو ئارام بگرینو دیسان سوپاسگوزار دەبین، تا پاداشتی ئارامگرتنمان لە دەست نەچێت، زانایەك دەڵێت: (بەڵای بەڵا ئەوەیە کە ئارامگر نەبیت) بەڕاستی وتەیەکی بە پێزە، وەك ئەوەی تووشی ناخۆشییەك بوویت، نابێت پاداشتی ئارامگرتنەکەیت لە دەست بچێت، بەڕاستی گەر مرۆڤ ئاوا بیری لە ژیان بکردایەتەوە، هەرگیز ناڕەزاییو گازندەمان لە کارەکان نەدەبوو، زووتر دەگەیشتین بە چارەسەرکردنی برینەکانمان؛ چونکە هەرشتێك بەسەر مرۆڤدا دێت، ڕەنگدانەوەو بیرکردنەوەی کارو گوفتاری خۆیەتی، دەتوانی بە چاککردنو بەرەوپێشبردنی هۆشو بڕیارەکانت، ژیانی خۆت جوانترو باشتر بکەیتو هێندەش خۆت بە نەفرەتکردنو ناڕەزایەتی دەربڕینەوە سەرقاڵ نەکەیت.



# وەڵامی بەجێ

جارێکیان پاشایەیەك، بە وەزیرێکی کۆستەی دەڵێت: ئەو ڕۆژی ڕیش دابەش کرا، تۆ لە کوێ بوویت؟

یەکسەر وەزیر گوتی: قوربان، ئەو ڕۆژە بەدوای ئەقڵو ژیریدا چوو بووم!

ڕۆژێك ئەبو حەنیفە، بە کۆڵانێکدا تێدەپەڕی، منداڵێکی بینی بە جێگایەکی قوڕاویدا دەڕۆیشت.. ئەبوحەنیفە دەنگی هەڵبڕیو گوتی: ڕۆڵەگیان، ئاگاداری خۆت بە؛ هەڵنەخلیسکێیت.

دەستبەجێ منداڵەکە وەڵامی دایەوە: هەڵخلیسکانی من ئاسانەو بۆی دامەچۆ چونکە کاتێك من هەڵدەخلیسکێم تەنها جلوبەرگەکانم پیس دەبێت.. تۆ ئاگاداری خۆت بە، هەڵنەخلیسکێیت؛ چونکە بەهەڵخلیسکانی تۆ، شوێنکەوتووانیشت هەڵدەخلیسکێن.

کۆمەڵێك فێرخواز، لە مامۆستاکەیان پرسی: بۆچی ئێمە، ناتوانین خودا ببینین؟

مامۆستاکە گوتی: هەمووتان پشت لە من بکەنو لەجێی خۆتاندا دانیشن، پاشان پرسی: ئایا ئێوە من دەبینن؟

فێرخوازەکان گوتیان: جا کە ئێمە، ڕوومان لە تۆ نییەو پشتمان تێ کردوویت، چۆن دەکرێت تۆ ببینین؟!

مامۆستاکە گوتی: کەواتە: ڕوو لە خودا بکەنو پشتی تێ مەکەن، تا ببینن!



# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

- ئەگەر دە گرفتت لە ڕێگاکەتدا بینی، ئەوە بزانە نۆ گرفتیان، لەمبەرو ئەوبەری ڕێگادا دەڕەوێنەوە، پێش ئەوەی پێت بگەن. کالڤن کوولیج

- هەموو کەسێ لە ئێمە، تووشی شکست بووە، لانی کەم هەڵکەوتووەکانمان تووشی بوون! جی - ئێم - باری ڕۆماننووس

- ئازارو ناڕەحەتییەکان، زۆر پێویستن.. لە پێناو پەروەردەکردنی عەقڵو گۆڕینی بۆ ڕۆح. - جۆن کیتس - شاعیر

- کەس نییە بەردەوام سەرکەوتوو بێت، ئەوەی وا بڵێت ڕاست ناکات، یاخود هەرگیز بەشداریی چالاکییە وەرزشییەکان ناکات. - ئەمار بۆسەلیم - یاریزان

- بۆچی هەمیشە مانگ زۆری دەمێنێ، کاتێك مووچە تەواو دەبێت؟! - جۆن باریمۆر - ئەکتەر

- بەختەوەری ئەوەیە: چۆن بژی، نەك چیت هەیە؛ چونکە بەختەوەری، خەڵاتێکی مەعنەوییە، نەك ماددی! - هیرمان هیسە - نووسەر

# جەنابی وەزیر

ئیبراهیم بەهادین خەتەیی

لەگەڵ دەنگی منداڵی کۆڵانەکەو فرۆشیارە گەڕیدەکان خەبەری بووەوە. سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، یانزەی بەیانی لای دابوو. چاوەکانی هەڵگلۆفیو هەستایەوە بەرەو دەستشۆرەکە ڕۆیشت. هەر بە جلی خەوەوە هاتە خوارەوە. لە چێشتخانەکەدا دایکی خەریکی ئامادەکردنی خوانی نیوەڕۆبوو.

*بەیانیت باش دایکە.

*سڵاو کوڕەکەم. کوا بەیانی ماوە! ئەوە نیوەڕۆیە تازە لە خەو هەڵدەستیت؟

* ئەی چی بکەم دایەگیان. کارێکتان پێ سپاردووم ئەنجامم نەدابێت؟ پاشان ئەی ئەوە نییە هەبووینو پێویستمان بە هیچ نییە؟ ئیتر من بۆچی کار بکەم؟

*ڕۆڵەگیان کارکردن تەنیا بۆ پارە پەیداکردن نییە. خودی کارکردن پێویستییەکی گرنگی ژیانە. پێشینان وتوویانە: (مرۆڤی بێکار، هەمبانەی بایە).

* دایەگیان واز لە فەلسەفە بهێنە، بۆ نیوەڕۆ چیمان هەیە؟

لەو کاتەدا باوکی دیار گەڕایەوەماڵەوە. قاتێکی ڕەشی لەبەردابوو. لە یەخەی کراسە سپییەکەیەوە بۆینباخێکی سوور شۆڕ ببووەوە. جانتایەکی دبلۆماسی بەدەستەوە بوو. پیاوێکی باڵا ناوەندی تێکسمڕاوی ئەسمەربوو. دوو بڕۆی ڕەشو پڕ، چاوەکانی داپۆشی بوو.

بەچەنــد هەنگاوێکی خێــرا بەرەو ژوورەکەی ڕۆیشــتو بە دیاری وت: بەدوامدا وەرە..

*گــوێ بگرە کوڕم. من نامەوێت لە فەرمانگەکەی خۆمدا تۆ دابمەزرێنم، بەڵام وەزیری (..) بەڵێنی پێداوم لای خۆی شوێنێکت بۆ دیاری بکات. بەیانی خۆت بڕۆ بۆلای، ئەم داواکارییەش لەگەڵ خۆت بەرە.

* بەڵام باوکە ئەی کۆلیژەکەم؟!

*کــوڕی خۆم تــۆ ئێــواران دەچیتە کۆلیــژ، بەیانیانیش لە فەرمانگەکەت دەوامی خۆت بکە، پاشــان خەڵکی دەســتی هەزار کــەس ماچ دەکەن بۆ دامەزراندن! تۆ ئەم هەلەت لەبەردەســتە، لەدەست خۆتی مەدە.

* باشە باوکە.. بەسەرچاو.

بەیانــی کاتژمێر نۆ دیــار لە نووســینگەی جەنابی وەزیر دانیشــتبوو. دوای نیو کاتژمێر ســکرتێرەکە ڕێگەی پێدا بچێتە ژوورەوە..

* ســڵاو قوربــان. باوکــم ســڵاوی بــۆ بەڕێزتــان هەبوو. داواکارییەکەم هێناوە.

* دەتەوێت لە کوێ دابمەزرێیت؟

* قوربان هەر شوێنێك ئێوە پێتان باشە.

* باشــە. بــڕۆ بۆ لای شــێخ ڕزگار لــە خۆیەتی، ئەو خۆی شوێنێکت بۆ دیاری دەکات.

* زۆر سوپاس قوربان.

شــێخ ڕزگار گەنجێکی باڵابەرزی سووروســپی بوو. لەبەشــی ســەرەوەی هۆڵێکی گەورە لە پشت مێزێکی نووسینگەی بریقەدار دانیشــتبوو. ژمارەیەکی زۆری فەرمانبەر لــە هۆڵەکەدا هەبوون. دیار مامەڵەکەی دایە دەســتیو وتی: جەنابی وەزیر منی بۆ لای تۆ ناردووە.

* بەخێربێیت. فەرموو دابنیشە. باوکت چۆنە؟

* زۆر سوپاس.

* دەتەوێت لە کوێ دابمەزرێیت؟

* ئەوەی ڕاســتی بێــت من ئێواران لە کۆلیــژ دەوام دەکەم. ئەگەر لە شوێنێك بێت لەگەڵ دەوامی کۆلیژ بگونجێت باشترە..

* لە نزیك ماڵی خۆتان فەرمانگەیەکمان هەیە. کاك عەباس لــەوێ بەڕێوەبەرە. وابزانم ئەوێ بۆ تۆ باشــە. بڕۆ بۆ لای ئەو. سڵاوی منیشی پێ ڕابگەیەنە.

* زۆر سوپاس.

ژوورەکــەی کاك عەبــاس ژوورێکــی بچووك بوو. کورســیو مێزێــکو قەنەفەیەکی ســادەی تێدابــوو. کاك عەباس پیاوێکی لاوازو باڵابــەرزی ڕەش ئەســمەربوو، بەڵام تــا بڵێی ڕووخۆشو خوێن شیرین بوو، بەخێرهاتنی "دیار"ی کردو چایەکی بۆ بانگ کــرد. دیار مامەڵەکەی دایە دەســتیو وتی: من کوڕی مامۆســتا عوسمانم. شێخ ڕزگاریش سڵاوی هەبوو.

* منیــش پێــم دەڵێن عەباســە ڕەش. شــێخ ڕزگارو بابت ڕێــزی تایبەتیان لەلای من هەیــە. چایەکەت بخۆ. ئینجا دەچین بەفەرمانبەرەکانت دەناسێنم.

ســەرەتا دیار ڕۆژانــە کاتژمێر نۆ، تا ١٢ ی نیــوەڕۆ دەوامی دەکــرد. دواتر هەندێك ڕۆژ نەدەهات بۆ دەوام. ڕۆژێك عەباســە ڕەش پێــی وت: لەبەرئــەوەی تۆ قوتابیــتو لەبەر خاتری بابت، هەفتانە تەنیا یەك ڕۆژ وەرە بۆ دەوام. هەندێك نوکتەو قســەی خۆشو چایەکیش پێکەوە دەخۆینەوە..

کاکە دیار هەفتانە یەك ڕۆژ هەندێك شــیرینیو چەرەســاتی لەگــەڵ خــۆی دەبردو ســەعاتێك دەمایــەوەو ســەری مانگیش مووچەکەی خۆی وەردەگرت.

ڕۆژێکیــان دیــار دوای ئــەوەی لەگەڵ هاوڕێکانی لــە چایخانە یەکتریان جێ هێشــتو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، هەرچەندە ئەو ڕۆژە دەوامــی نەبوو، بــەڵام بەخەیاڵیدا هات ســەردانێکی فەرمانگەکەی بکات.. کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ بوو، ئۆتۆمبیلەکەی سووڕاندەوە بەر دەرگای فەرمانگەکەو پاسەوانەکە دەرگاکەی کردەوەو چووە ژوورەوە.

پاسەوانەکە وتی: کاکە دیار هەموویان ڕۆیشتوونەتەوە، تەنیا من لێرە ماووم. وەرە با چایەکت بۆ ئامادە بکەم.

خەریکی خواردنەوەی چایەك بوون، کاتێك چوار ئۆتۆمبێلی جــام ڕەش گەیشــتنە فەرمانگەکــەو چەکــدارەکان بــە گورجی دابەزینو جەنابی وەزیر لە ناوەڕاســتی گۆڕەپانی فەرمانگە هاتە خوارەوە. دیار بەخێرایی هەنگاوی نا، تا گەیشتە بەردەم جەنابی وەزیرو بەخێرهاتنی کرد.

وەزیر دەســتی لەســەر شــانی دیار دانابوو، بەرەو کارگێڕی دەڕۆیشتو وتی: دیار لەگەڵ دەوامدا چۆنی؟

* زۆر باشم قوربان.

* بابت ئێستاش سەروپێ دەخوات؟

* بەڵی قوربان.

*بابە پێی بڵــێ واز بهێنێت، ئەو بەتەمەندا چووە. بەرگەی جەڵتەیەکی تر ناگرێت!........چییە؟...تەنیا تۆ لێرەیت؟

*قوربان کاك عەباس بەکاری فەرمی دەرچووەو...ئەوانی تر.. هەندێکیان مۆڵەتن....و هەندێك.....یان....

جەنابی وەزیر گەڕایەوە ناو ئۆتۆمبیلەکەیو چەکدارەکان بە گورجی بەدوایدا سەرکەوتنو فەرمانگەکەیان جێهێشت..

ڕۆژی دواتــر فەرمانێکی وەزاری دەرچوو بە ئاراســتەکردنی ســوپاسو پێزانیــن بــۆ دیاری مامۆســتا عوسمانو ســزادانی ســەرجەم فەرمانبەرانــی فەرمانگەکــەی عەباســەڕەش؛ بەهۆی پابەندنەبوونیان بەدەوامی ئاسایی خۆیان.

لــە ســەرنەکەوتن دەترسـیت، ئایا سـامو دڵەکوتــەی بەکام نەگەیشــتن دایگرتوویت، حاشا لەو ســاتانەی ڕابوردوو دەکەیت، کە تیایدا ســەرکەوتوو نەبوویت؟ ئەگــەر وەڵامەکەت "بەڵێ"یە، کەواتە: کێشــەت هەیە، زۆربــەی گومانەکان بۆ ئەوە دەچێت، تۆ ناتوانیت خەونەکانت بەدی بهێنیت.

هاوڕێی ئەزیزم، شکست، سەرکەوتنو کرۆکی بەکام گەیشتنە! ســەرکەوتوویەك لەژیانــدا نابینین، ڕۆژێك لــەڕۆژان نەگلابێت، بەرەنگاری هەرکەسـێك دەبمەوە، کە جورئەت بەســەر یاساکانی گەردوونــدا بــکات، وا بزانێــت ســەرکەوتن هەمیشــە یــاوەری ئادەمیزادە. سەرنەکەوتن پوختەی تافیکردنەوەکانمانە، چاکسازیو ڕاستکردنەوەی هەڵدێرەکانی ژیانە، پلەیەکە بۆگەیشتن بەکۆشکی سەرکەوتن.

ســەرەك وەزیرانی پێشووی شانشـینی یەکگرتوو (وینستۆن چەرچــڵ)، پێناســەیەکی جوانــی ســەرکەوتن دەکاتو دەڵێــت: ســەرکەوتن بریتییــە لە: توانــای گوێزانەوە لەشکســتێکەوە بۆ یەکێکی تر، بێئەوەی ئیرادە لەدەســت بدەیت. وەك ئەوەی بەکام نەگەیشــتن بنەمایەك بێت لە بنەماکانی شکســت، بێ شکســت سەرکەوتن مەحاڵە، دوور لەگلان، چێژی سەرکەوتن مەحاڵە.

ئەم دەســتەواژەیە واتــای ئەوەیە ئایا ئێمە بەشکســت ڕازی بیــن، بێدەنگ بیــن بەرامبەری!؟ بێگومان نا، ئــەوە لغاوکردنی ئاواتەکانمانــە، ئێمــە زیاترمان لە تۆ گەرەکــە، ئەوەی لە تۆمان دەوێت بایەخدانە بەشــتێکی زۆر گرنگ، ئەوەش ئەوەیە شکست بەشـێکە لــە دەســتکەوتەکان؛ چونکە دەتەوێــت کارێك ئەنجام بدەیت، دڵەکوتێ نزیکە لەو کەســەی دەیەوێت ئاوازی گۆڕانکاری بچڕێت.

زۆر بەســادەیی، چەندێــك لــە ژیاندا کارابیــت، کارو کۆششــت زۆربێت، چەندێك بزۆز بیت هێندەش دەگلێیت، بەپێچەوانەوە ئەوانەی لە گۆشــەی تەنیایدا دانیشــتوونو ئەژنۆکانیان توند لەباوەش گرتووە، خزمەتگوزارێکی باشی

و: چیمەن لەتیف



خۆیانو کۆمەڵگاکەیان نین.

وەڵامــی گونجــاو بۆشکســت بریتییــە لــە: ســەرکەوتنێکی یەکلاکــەرەوە، مامەڵەی نموونەیی لەگەڵ شکســتدا بریتییە لە: دووبارەکردنەوەی ئەزموونەکان، لێکۆڵینەوە لەهۆکارەکانی بەکام نەگەیشتنو سەرکەوتن بەسەریدا. بەداخەوە، لەژیاندا کەسانێکی زۆر شکســت کۆڵــی پێــداون، کەســانێك هــەن نزیــك دەبنەوە لەســەرکەوتن لــەو کاتەدا بەهــۆی شکســتێکەوە لەکارێکدا کۆڵ دەدەنو پاڵ دەدەنەوە، دواتر خۆبەدەست شکستەوە دەدەن.

بەڵــێ زۆرن ئەوانــەی دەوســتن؛ بۆئــەوەی تاڵاوی شکســت نەچێــژن، بــەڵام هەســت ناکەن ئــەوان چەند نزیــك بوونەوە لەشکست ئەگەر "بەچەکی ورەو خۆڕاگری خۆیان تەیار نەکردابا"

ئاینی ئیســلام لەکاروکۆششدا بەرنامەیەکی پتەوی دارشتووە، بەربەســتە دەروونییــەکان لادەبــات کە ئاســتەنگن لــە بەردەم تاقیکردنەوەو دەرکەوتنی ورەی کەسی تێکۆشەردا.

لــە فەرموودەی پەیامبەردا هاتووە "ئەگەر زانایەك کۆششــی کرد"واتەبڕیارێکــی دەرکــرد" بڕیارەکــە درووســت بــوو، ئەوا دووپاداشــت وەردەگرێت، بــەڵام هەمان کەس ئەگــەر بڕیارێکی دەرکردو نەیپێکا، ئەوا خودا یەك پاداشتی پێ ڕەوا دەبینێت.

ئــەوە باوەڕێکــە، شــوێنکەوتوانی هانــدەدات بۆچــوونو کۆششــەکانیان تاقی بکەنەوە، ئەوکارانــەی تەواوی دەکەن هۆکار بگرنەبــەرو بەرەنگار ببنــەوە، ئەوکات تەنانەت هەڵەکانیشــیان لەبەرچاو دەگیرێت.

کاتێك سەرکەوتوو نابین پێویستە چیبکەین؟

ئــەم خاڵانە یارمەتیدەرن بۆ تێپەڕاندنــی ئەو تاقیکردنەوە شکستخواردووانە کە پێیدا تێدەپەڕیت:

١. دڵنیابە بەکام نەگەیشــتن ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ کەسێکی سەرنەکەوتوویت. سرووشتییە کاتێك سەرناکەویت غەمبار بیت، ئــازار بچێژیــت کاتێك بەکامی دڵی خــۆت ناگەیت، بەڵام گرنگ ئەوەیــە نەهێڵیت هەســتە خراپەکان بەســەرتدا زاڵبنو دەســت لەبینــت بنێن. ئەوەی گرنگە جیاکاریە لــە نێوان لێپێچینەوەی دەروون بەمەبەســتی فێربوونو زیاد ســەرکۆنەو باســکردنێتی بەنەزانو هەست پێنەکەر.

٢. دڵنیابە شکست ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ ناتوانیت ئەو کارەی مەبەستە تەواوی بکەیت.

ســەرنەکەوتنت لەژیانی هاوســەریتدا ئــەوە ناگەیەنێت کە تۆ هاوســەرێکی خراپی، یــان لەداهاتوودا بەکامــی دڵ ناگەیت، سەرنەکەوتن لە کارێکدا ئاماژە نییە؛ بۆئەوەی تۆ شایانی ئەوکارە نیت، دەبێت بەشوێن کاری تردا وێڵ بیت.

نەخێر.. ســەرنەکەوتن لەتاقیکردنەوەیەکــدا وات لێدەکات، لەدووبارەکردنــەوەی هەمان تاقیکردنەوەدا زیاتر هۆشــیار بیت، کەمتــر هەڵە بکەیت، بەمەرجێك لەتاقیکردنەوەکانی ڕابوردوودا شارەزایت پەیدا کردبێت.

٣. جیــاکار بــە لە نێوان شکســت لە هەڵبژاردنــی ئامانجو دیاریکردنــی ڕێــگادا؛ چونکــە زۆربەمــان کاتێــك لەگەیشــتن بەئامانجێکدا شکست دەهێنین، لەمەبەستەکە دەکەوینە گومانەوە، لەکاتێکــدا گرفتەکــە تەنهــا لەهەڵبژاردنــی ڕێــگای "چۆنێتیی تەواوکردنــی کارەکەکەدایە"، ئەم تێکلاوکردنە مەترســیدارترین کارە کاتێــك ڕووبەڕوومــان دەبێتــەوە! چونکە بەشــێکی زۆری تەمەنمــان لە نێــوان دیاریکردنی ئامانجێــكو دوورکەوتنەوە لە مەبەســتێکی تر بەفیــڕۆ دەدات، وامان لێــدەکات بیرو هزرمان پــەرت بێت لە نێوان ئەوەی دەمانەوێت، پەشــۆکاوبین، نەزانین چیمان دەوێت، لە کاتێکدا تەنها ئەوەی دەمانەوێت ڕێگایەکی ترە بەگەیشتن بەوەی گەرەکمانە.

٤. دڵنیابــە شکســت تەمەنت بەفیــڕۆ نادات. ئاخ مەکێشــە بۆکارێك، لەڕۆژانی ڕابوردوودا تەواوت کردووەو تێیدا سەرکەوتوو نەبوویت، باوەڕ بکە، ئەو زانیارییانەی لە چەمەدان"سندووق"ی زانیارییەکاندا کەڵەکەت کردوونو وەسەریەکت خستوون، نرخیان ناخەملێندرێت، ژیان چییە؟ کۆمەڵێك تاقیکردنەوەیە. پەیامبەر (درودی خودای لێ بێت) هەمیشــە هانمان دەدات بەوەی (بەهاو درووستی کارەکان، پەند وەرگرتن لێیان لەکۆتایدا دەردەکەوێت).

٥. شکست واتای شکست نییە!!! بەلاتەوە سەیر نەبێت شکست ئــەوە ناگەیەنێــت کە تــۆ بڕوانامەی ســەرنەکەوتن وەربگریت، یــان دنیا پەنجەی تۆمەتباریت ئاراســتە بکات، یاخود بەچاوی گومانو دڕدۆنگییەوە تەماشــات بکەن. هەروەها ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ پۆشــاکی زەلیلی بپۆشیت، ئەوەی ماوە لەتەمەنت لەریزی تەوەزەلان شکستخواردووان‌دا بێیتە ئەژمار، نەخێر.

ئــەوە تاقیکردنەوەیەکــە، کۆتایی کایەکە نییــە، ڕووداوێکە، جەنگ نییــە... قۆناغێکــە، کۆتایی یارییەکە نییــە. باوەڕبکە... خۆری ســەرکەوتن نادرەوشــێتەوە، ئەگەر تاریکیو شکست پێشی نەکەون.

پوختە: فێربە چێژ لەشکست وەرگرە، ڕامێنە لە شکستەکانت، تــا لەنێــوان تاریکــی ســەرنەکەوتنەکانتدا پانتایــی ڕووناکــی بدۆزیتەوە، دواتر دەرگای هەموو ژیانتی پێ ڕووناك بکەرەوە.

دڵنیابە، شکستی ڕاستەقینە ئەوەیە ئەو کەسە بێئیرادە بێت لــە دووبارەکردنەوەی هەوڵەکان، گرنگترین خشــت لە بنیاتنانی سەرکەوتندا، خشتی سەرنەکەوتنو بەکام نەگەیشتنە.

دڵۆپە:

شکســت دوو جــۆرە: جۆرێکیــان: بیرکردنەوەیــە بــەدەر لــە کــردار. جــۆری دووەمیــان: کردارێکــە بــێ بیرکردنــەوە (جۆن چارلز سالاك)

ئەسکەندەر ڕەحیم



# ١٦ وانەی هیوابەخش لە بڕووسلییەوە

"لە هەموو شتێکی بەسوود سەرودەر بکە، هەموو شتێکی بێسوودیش وەلا بنێ"

بڕووسلی کەسێتییەکی هیوابەخشەو پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە سیو پێنج ساڵ بەسەر مەرگیدا، هێشتا بڕووسلی ئامادەییەکی بەهێزی هەیەو کاری لە زۆربەی لایەنەکانی ژیانمان کردووەو هیوای بەزۆر کەسی جیهان بەخشیوەو بووە بە سەرچاوەیەك بۆ هێنانە کایەی داهێنانەکانیان.

ڕەنگە لەوەی کە کاری لە زۆر کەس کردووە.. کۆك، یان ناکۆك بین، بەڵام ناتوانین حاشا لە کارتێکردنەکەی بکەین، دەسا بڕووسلی، چۆن توانی گۆڕانکاری لە ژیانی زۆر کەسدا درووست بکات؟!

ئەم بابەتە، ژیننامەی پاڵەوانی کاراتێو دامەزرێنەری "جیت کان دۆ" نییە، کە توانی یارییە بەرگرییەکان زەق بکاتەوەو بیخاتە لیستی کارە سەرەکییەکانی کەسانی دیکە، تا فێری ببنو تاقی بکەنەوە، بەڵکو هەوڵێکە بۆ فێربوونی ئەو وانە هیوابەخشانەی کە وای کردووە، بڕووسلی ببێتە کەسێکی گەورەو گران، لەکاتێکدا تەمەنی ٣٢ ساڵ زیاتری تێنەپەڕاندووە.. ڕەنگە هەندێك جووڵەی ئەوت کردبێتەوە، یان کەسێکت دیوە لاسایی کردووەتەوە، زۆرێکیش لە ئێمە، لە دەورانی منداڵیی خۆیدا، لاسایی جووڵەکانی کردووەتەوەو لەگەڵیدا ئەو دەنگەمان گوتووەتەوە، کە لە میاوی پشیلە دەچێت لە کاتی شەڕدا!

وەکو گوتمان، ئەوەی سەیرە، بڕووسلی لە ترۆپکی چالاکیو بەخشینیدا، کە ٣٢ ساڵی تێنەپەڕاندبوو، دنیای ڕۆشنی بەهۆی خواردنی قومێك دەرمانی زیادە ـ وەك لەناو خەڵکیدا بڵاوە ـ بەجێ هێشت. ئەمەش کەسانی دیکەی ناچار کرد، تا بە چاوی ئەوە لێی بڕوانن، کە لەناو کۆمەڵگەدا، کەسێکی بەهێزو ئەرێنییەو توانیویەتی کار لە جیهانو دەوروبەری بکات.. هەروەها ئەو سەردەمەی بڕووسلی تێیدا ژیاوە، گاڵتە کراوە بەو مرۆڤانەی سپی پێست نەبوون، ڕەنگی زەرد پێستەکانی هاوشێوەی ئەو، بە خزمەتکارو بەردەست، یان بە کەسێکی کڵۆڵو سەرکز دادەنران، لەگەڵ هاتنە نێو مەیدانی بڕووسلیدا، توانی تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بگۆڕێت.

لە جیهانی هاندانی خودو پشتبەخۆبەستندا، بڕووسلی کەسێتییەکی گەرموگوڕە.. تۆش دەتوانیت کۆمەڵێك دەرسو پەندی لێوە فێر بیتو ئەوەی بەگونجاوی دەبینیت، پەیڕەوی بکەیت. دەسا ئەو دەرسانە چین، کە لە بڕووسلییەوە فێر دەبین.

١. لە ژیانتدا ئامانج دابنێ:

تۆ لە هەسارەی زەویدا، تەنها ژیانێکت هەیەو دووبارەبوونەوەی نییە، لەبەرئەوە پێویستە کۆمەڵێك ئامانجی گەورەوگران بۆ خۆت دابنێیتو بەدوایاندا بچیتو ڕایان بپەڕێنیت، لەبیرت بێ؛ تۆ شایستەی ژیانێکی ناوازەیت، لەوە کەمتر پێی ڕازی نەبیت.

٢. بۆ ئەو کارانەی دەتوانیت پێشکەشی دەکەیت، سنوورێك نییە.

ڕێ بە کەس مەدە؛ سنوورو کەوشەن بۆ هیواو ئاواتەکانت دابنێ، با خۆیشت بیت!

ئەمە سۆعبەتو گاڵتە نییە؛ کاتێك بینیت خۆت لە کارە بەرزو سەنگینەکان دوور دەخەیتەوە، بە کارە کەمبایەخو لاوەکییەکانت پێ پەسەندە، یان بەدوای ژیانێکدا دەگەڕێیت، دەردەسەریو ناڕەحەتی نەبێت، ئەوا کاتی ئەوە هاتووە، خۆت لە کاری دژوار وەربدەیتو بەرەنگاریی باری نالەباری خۆت ببیتەوە، تا دەروونت لە بنی ئەو گێژاوەی تێت کردووە، ڕزگار بکەیت.

### ٣. بەختەوەری خۆت دەربڕە:

چاوەڕێی موعجیزە مەبە، بۆئەوەی هەست بە بەختەوەری بکەیت، ئێستە هەستی پێ بکە، خۆشی لە بەختەوەرییەکەت ببینەو بەسەر سەرجەم جێگاو ڕێگاکاندا بیبەخشەرەوە.. بەختەوەریی تۆ، واتە: بەختەوەریی دەوروبەرت، سا بەختەوەریی ئەوانیش دوا مەخە.

### ٤. وێنەی ناخت جوان بکە:

ئەوی دەیهێنیتە بەر چاوی خۆتو بیری لێ دەکەیتەوە، زوو بۆت دێتە پێش.. لەبەرئەوە پێشبینیی باشتر بکە، باشترین کەس بە.. خۆ ئەگەر خۆت لە خۆت هەڵبێیت، کەسێك شك نابەیت، یارمەتیت بدات، تا خۆتت بەدڵ بێت پەسەندی بکەیت.. لەبەرئەوە بەرامبەر بەخۆت ڕەفتار زبرو ڕەقی مەنوێنە، لەبەرئەوە ترسو نیگەرانیت هێواش بکەرەوەو باسی باشیو سەرنجڕاکێشیی خۆت بۆ دونیا بکە.

### ٥. بەردەوام هەوڵی فێربوون بدە:

هەمیشە ئامادەسازیی فێربوونت لە هەر جێگەیەك بپارێزە، لەئاست ئەو دەرسو پەندە بێوێنانەی دەتوانیت لە ژیانەوە فێریان بیت، بێهەستو خوست مەبە. لە ئێستەو ئایندەدا، تا سەرەمەرگیش، هەر هەوڵی فێربوون بدە، خۆ ئەگەر لەو کارە ڕاوەستایت، وەکو ئەو کەسە وەهایت بە گوللەیەك کۆتایی بەژیانی خۆی دەهێنێت.

### ٦. بیرۆکەکانت بگۆڕە بۆ کردار:

لە هەر جێیەك بوویت، با جێدەستت دیار بێت. بیرۆکەکانت بە جەستەیەکی زیندوو، تا لەناو خەڵکدا جموجووڵو هاتوچۆ بکات. بەو ئەقڵە بچووکەی هەتە، دەتوانیت کاری ئەستەم ئەنجام بدەیت.. هەرگیز پاشەکشێ نەکەیت، چونکە هەر یەکێکمان چەند لایەنێکی پرشنگداری هەیەو دەتوانێت بۆ خزمەتی جیهان، بیانهێنێتە نێو مەیدان.. دەسا فێر بەو جڵەو بۆ بیرۆکاکانت ڕەها بکە.

### ٧. لە ئامانجەکانتدا قاڵو قووڵ بەرەوە:

هەردەم چاوت لەسەر ئاراستەی درووست بێت، هزروهۆشت بەو شتانەی ساردت دەکەنەوە قاڵ مەکە.. تەنها چاوت لەو جێیە بێت، کە ئامانجەکەتی لێیە، ئیدی هەموو هێزو وزەت بەدووت دەکەون.. گەرچی تووشی کەندولەندو سەختیو دژواری بیت، تۆ هەر بە ئامانجەکانتەوە پەیوەست بە؛ چونکە لە ئاکامدا دەگەیت بە لووتکەو لەوێ هەندێك کەس دەبینیت، وەکو تۆ کاریان کردبێت.. دیارە لە لووتکەشدا، هەمیشە تێکچڕژانو پاڵەپەستۆ کەمە!

### ٨. بەکەم لە کاتت مەڕوانە:

لە هەمبانەی ڕۆژانەتدا، ٢٤ سەعات هەیە.. نەکەیت ڕۆژت بەبێ لیستی ئامانجەکانت تێبپەڕێنیت. چیت لەسەر شانە، ڕای بپەڕێنە، دواتر دەبینیت ژیانت بەرەو باشتر گۆڕاوە.. لە کات بەخشینت، بەو شتانەی پەیوەندی بە تۆوە نییە، چەکلو چرووکی بنوێنە.

### ٩. شکست، یەکەمین هەنگاوی سەرکەوتنی تۆیە.

لەگەڵ شکستو ناکامیدا، هەروەکو هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی هەڵسوکەوت بکە! لە ئاست هەر ئەزموونێکی شکستخواردوودا، نەکەی نائومێدو بەدبین بیت، زۆریش بە دیاریەوە ڕامەوەستە، چونکە تا زووتر شکست بەجێ بهێڵیت، لە سەرکەوتنەوە نزیکتر دەبیتەوە!

### ١٠. نەسرەویت، تا سەر دەکەویت

خەڵکی تەممەڵ نین، بەڵکو ئامانجی مەزنیان نییە، تا لە پێناویدا بژین، سا لەبەرئەوە بۆ ئامانجە مەزنەکانت بکۆشە، مەسرەوەو کۆڵ مەدە، بۆئەوەی ببن بە ژیانی نوێی تۆ، ناشتوانیت بەدییان بهێنیت، گەر ڕاوەستایتو بەدوویاندا نەچوویتو بۆیان بەخەم نەبوویت.

### ١١. نەرمو هەویری بەو لەگەڵ دەوروبەردا هەڵبکە:

هەروەکو ئاو بە.. بە نێو بەردەکاندا تێپەڕ دەبێت.. کە دەیخەیتە ناو پەرداخێکەوە، شێوەی پەرداخەکە وەردەگرێت، گەر بیخەیتە پیاڵەیەکەوە، خۆی لەگەڵیدا دەگونجێنێت، لە ئاست ئەو شێوازەی ئامانجەکەتی پێ جێبەجێ دەکەیت، نەرمونیان بەو بە یەك شێوازەوە دەق مەبەستەو گەر شێوازەکەت سوودی نییە، بیگۆڕە.

### ١٢. سادەو ڕەوان بە:

کاتێك لە دەستنیشانکردنی ئەو شتانەی دەتەوێت بۆ ژیانت، ڕێكو ڕەوانو ڕوون دەبیت، ئەوا چیت دەوێت، دێتە بەر.. بەردەوام لە خۆت بپرسە: (ئایە ئەو کارەی ئێستە ئەنجامی دەدەم، دەمگەیەنێت بەو شوێنەی دەمەوێت؟)

### ١٣. پەیوەندییەکان بەرفراوان بکە:

گەر لە کەسانی دیکەوە دوور بیت، ناتوانیت کار لە ژیانیان بکەیت.. گەر بازنەی ئاشناو ناسیاوەکانت سنووردار بێت، ئاسان نییە زیاد لەو جێگایەی لێی وەستاویت، تەشەنەو گەشە بکەیت.

### ١٤. یاسا بەربەستەکان بشکێنە

یاساکان بۆ ئەوە دانەنراون، تاکو کۆتو کەلەپچەمان بکەن، بەڵکو بۆ ڕێکخستنی ژیانی ئێمەیە، خۆ ئەگەر هەندێك لەم یاسایانە، ببنە درکودالی سەر ڕێو ببنە بەربەستی ڕێی پێشکەوتنمان، پێویستە خۆمانی لێ قوتار بکەینو تێکیان بشکێنین!

### ١٥. خزمەتگوزارییەکانت پێشکەش بکە:

ژینی ڕاستینە، بریتییە لەوەی لە پێناوی کەسانی دیکەدا بژیت، دەتوانیت هەر خواستێکی ژینت بەدی بهێنیت، کاتێك بەشی دەوروبەری تێدا بێت!

### ١٦. جوانترین ساتەکانی ژینت بەسەر بەرە

جوانترین ساتەکانی ژیانی تۆ، ئێستەیە، بزەی پرشنگداری سەر ڕوومەتت دوا مەخە، پەکی ئەو کارە باشانە مەخە، کە دەتوانیت بۆ خۆتو کەسانی دەوروبەرت ئەنجامیان بدەیت.. سەرکەوتنو خۆشحاڵیت پاش مەخە، چونکە بەڕاستی دەبێت بەهۆی ئەوەی سەرکەوتنو بەختەوەریی دەوروبەرت پاش بکەوێت.

# پەیکەری برۆنز

کەریم سمکۆ

بۆ ڕێزگرتن لە ماندووبوونو شەونخوونی نووسەرێك، سەرۆكی شارەوانی شار بڕیار دەدات پەیكەرێكی جوانو شایستەو بەرز بە ماددەی برۆنز بۆ نووسەرێكی شارەكەیان دروووست بكات.

كاتێك نووسەرەكە لەناو كەلاوەكەی خۆی هەواڵەكە دەبیستێتەوە، یەكڕاست خۆی دەپێچێتەوەو ڕێگەی شارەوانی شارەكەیان دەگرێتەبەر، لە ڕێگادا چەندان فیكری بە خەیاڵدا دێت.. ئایا ئەم حكوومەتە بۆچی بیری لە دروووستكردنی پەیكەرێك كردۆتەوە بۆ نووسەرێك، كە تەنیا خەیاڵەكانی خۆی خستوونەتە سەر كتێبو بە تەنها لایەنگرێكی زۆری خوێندنەوەی هەیە؟ دەبێت شتێك هەبێت؟! بۆ نایەت لەبری ئەوە لەو ژیانە ڕزگاری بكاتو دەستی بگرێت؟ ڕەنگە ئەمە مەبەستێك خۆی تێدا حەشار دابێت!

پیرە نووسەرەكە بە گۆچانەوە كاتێك دەگاتە شارەوانی دەچێتە بەردەم سەرۆكی شارەوانیو بە دەنگێكی لەرزۆكەوە سڵاوی لێ دەكات. ئەویش لەسەر مێزەكە بە فیزێكەوە بە تەلەفۆن قسە دەكاتو دەڵێت: ئا ئا.. دەبێت ڕێوڕەسمێكی شایستەی بۆ بكەین، ئەو ڕۆژەی كە پەردەی لەسەر لا دەدەین، هەموو بەرپرسو كاربەدەستانی دەوڵەت داوەت دەكرێن، دوێنێش نووسەرەكە لێرەبوو زۆر دڵی بەم پرۆژەیە خۆشبوو، ستایشی كارەكانی ئێمەی كرد، ئێمەش بۆ ڕێوڕەسمەكەی سبەی سوپرایزێكی جوانمان بۆ نووسەرەكە ئامادەكردووەو جلێكی شیكپۆشی جوانمان بەدیاری پێدا؛ بۆئەوەی لەكاتی پەردە لەسەر لادان جوان دەربكەوێتو هاووڵاتیانی ئەم شارە شانازی پێوە بكەن. بەڵێ.. بەڵێ.. چەند جارێك هاتووەتە لامانو كەمێكیش لە خەرجیی پرۆژەكەیمان پێداوە؛ بۆئەوەی كەمێك بژێوی ژیانی باشتر بكات! هەر نەبێت بەرهەمێكی دیكەی بە چاپ بگەیەنێت.

دواتر سەرۆك تەلەفۆنەكە دادەخاتو وەك ئەوەی سەردانكەرێكی هاتووە، بەخێرهاتنێكی سەرپێیی لە پیرەمێردەكە دەكاتو پێی دەڵێت: فەرموو خاڵەگیان چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟

ئەویش پێی دەڵێت: ئەزبەنی بیستوومە بڕیارتان داوە پەیكەرێكی برۆنز بۆ نووسەرێكی بەنێوبانگی ئەم شارە دروووست بكەن، كارێكی چاك دەكەن.

ئەویش بە خۆزلزانینەوە دەڵێت: بەڵێ.. بەڵێ. بێگومان دەنگی داوەتەوە لە ڕۆژنامەكان، ئەی پیرەپیاو تۆ چۆن زانیوتەو كارت بەمە چییە؟

-وەڵڵا قوربان من كارێكی گرنگم پێی هەیە، چونكە ئەو نووسەرەی كە پەیكەرەكەی بۆ دروووست دەكەنو پارەیەكی خەیاڵی تێدا خەرج دەكەن، ئەوە منم!

سەرۆكی شارەوانیش چاوی ئەبڵەق دەبێتو لە خولەكێكدا ڕوخساری لە ڕەنگی سوورەوە بۆ ڕەشو دواتر بۆ مۆر دەگۆڕدرێت، ئارەقەیەكی شەرمەزاری دەكاتو لەم دۆخەدا حەزی دەكرد، ببێتە قەترەیەك ئاوو بە ناخی زەویدا بچێتە خوارەوە.. دواتر خۆی هێور دەكاتەوەو بەخێرهاتنی دەكاتو بانگی بەردەستەكەی دەكات؛ بۆئەوەی قاوەیەكی بۆ بانگ بكاتو خزمەتی بكات، خۆیشی هەڵدەستێتە سەر پێیانو بەملاو بەولای نووسەرەكە بۆ خزمەتكردن هەڵبەزو دابەزین دەكات..

ئەویش بەهێورییەوە پێی دەڵێت: خۆتان شپرزە مەكەن، وەڵڵاهی ئەگەر ڕاستیتان دەوێت، نە قاوە دەخۆمەوە، نە پێویستیشم بەوەیە لەم ژیانەمدا پەیكەرێكی زەبەلاحم بە بودجەیەكی گەورە لە برۆنز بۆ دروووست بكەن، ئاخر من حەوجێی پاروە نانێكی شەوانەم، ئەگەر نیوەی ئەو پارەیەی لە پەیكەرەكە خەرجی دەكەن بیدەنە من، هەموو ڕۆژێ لە بەیانییەوە، تا درەنگانی شەو لە هەمان شوێنی پەیكەرەكە خۆم ڕادەوەستم.



# دەبیستم... دەبینم...

و: کارزان مەحموود

ڕێگای چوون بۆ قوتابخانە زۆر دلگیرو سەرنجڕاکێش بوو، درەختەکانی قەراغ ڕێگاکە سێبەرەکەیان بەوێنەی ڕایەخێك ئەو ناوەیان داپۆشیبوو.

بۆنی یاسەمینو پرتەقاڵو گوڵە بۆنخۆشو جوانەکانی دڵی ڕێبوارانی بەرەو ئەوناوە کەمەندکێش دەکرد، هەر بۆیە خەڵکی زۆر ئارەزووی پیاسەیان دەکرد بەو ناوەدا، لەو ڕێگەیەدا بەبەردەوامی چاوم دەکەوت بە دراوسێکانو هاوڕێیانو خزمان، بەڵام ڕۆژێك لەڕۆژەکان تەنها سێ کەسم پێ گەشت لەو ڕێیەدا، کە هەرسێکیان هاوتەمەنی خۆم بوون، دوای تێپەڕبوونی چەندان ساڵ، بەڵام هێشتا ئەو چاوپێکەوتنەم هەر لەبیرە، کە ژیانمی گۆڕیو یەکپارچە ژیانمی کرد لە ئومێدو هیواو گەشبینی.

لەسەرەتای ڕێدا: گەیشتم بە (هاوڕێی یەکەمیان)، کاتێك نزیك بوومەوە، بینیم نابینایە، بەغەمبارییەکەوە پێم وت: هیوادارم دلگران نەبووبیت، بەخێرایی وەڵامی دایەوەو وتی: بۆچی دەبێت دلگرانو دڵتەنگ بم؟.. من...کە ناتوانم ببینم، دەتوانم ببیستم دەتوانم قسە بکەم، دەتوانم بڕۆم، هەر دوێنێ هۆنراوەیەکم نووسیووە (سبەینێ لەئێزگەی قوتابخانە بۆ هاوڕێکانمی دەخوێنمەوە)...پاش ئەوە بەجێم هێشت، قسەکانی زۆر دڵخۆشی کردمو سەرم لە گەشبینییەکەی سوڕما.

لەناوەڕاستی ڕێگەدا: گەیشتم بە (هاوڕێی دووەم)، کە نەیدەتوانی ببیستێتو قسە بکات، بەئاماژە پێم وت: دڵتەنگ مەبە: ئەویش بە ئاماژە وتی: شتێك لە ئارادا نییە کە دڵتەنگم بکات، بەڵێ من ناتوانم ببیستمو قسەبکەم، بەڵام دەتوانم بخوێنمەوە، دەتوانم ببینمو دەتوانم بیربکەمەوە، من دەتوانم وێنەی جوان بکێشم... بۆ جارێکی تر دەروونم لێوانلێو بوو لەسۆزو ڕێزو خۆشەویستیو سەرسوڕمان.

پاشان لەڕێکردن بەردەوام بووم، لە کۆتایی ڕێگەکەدا گەیشتم بە (هاوڕێی سێهەم)، کە لەسەر کورسیەکی جووڵاو دانیشتبوو، بەڵام پڕ لە هیواو گەشبینیو خۆشویستنی ژیان، دوای ئەوەی پرسیم وتی: من تەنها یەك شتم لەدەست داوە، بەڵام تاوەکو ئێستا خاوەنی زۆر شتم، من دەتوانم ببینمو ببیستمو قسە بکەم، دەتوانم گۆرانی بڵێم، دەتوانم ئامێرە مۆسیقییەکان بژەنم، توانیومە سەرکەوتووبم لە خوێندن، هەوڵ دەدەم لە داهاتوودا ببمە پزیشکو ئازارەکانی خەڵکی سارێژ بکەمو ژیانیان پڕ بکەم لە خۆشی...... دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، دانیشتمو بیرم کردەوە لە سێ هاوڕێکەم، قسەکانیان لە گوێمدا دەزرینگایەوە.. بە خۆمم وت: چەندە بەهێزن ئێوەی هاوڕێم!! بەوێنەی گوڵ هەرگیز دڕکەکان نەبوونەتە ڕێگر لە گەیشتن بەهیواو ئاواتەکانتان... ڕازین بەوەی کە هەتانە.. ئەوەی کە نیتانە نەبۆتە بەربەستو بێهیوا بوون..... هەربۆیە دیسان بەخۆمم وت: ئیتر لە ئێستاوە ئەوە ڕاست نییە کە بڵێم: ناتوانم، نازانم، لەبەرئەوەی خاوەنی تواناکانمو هیچ شتێکم لەدەست نەداوە.. زۆرترین پرسیارێك کە لەخۆمی بکەم...ئێوەش پێویستە لەخۆتانی بکەن ئەوەیە کە: ئایا ئەوەی کە بینیم خەونبوو، یان ڕاستی، یان ڕاستییەکەو لەخەون دەچێت؟ ئەوە دەڵێم: چ خەون بێت، یان ڕاستی، گرنگ ئەوەیە وانەیەکی گەورە فێربووم، کە ژیانمی پڕکرد لە هیواو ئومێدو گەشبینیو سووربوون بۆ گەیشتن بەخۆشییەکانی ژین...

سەرچاوە/ مجلة العربي الصغير



# نووسەران!

ئارام نەبی مەحموود

نووسەران؛ هەندێجار جگە لە پەڕەو خامەیەك شتێكی تر شك نابەن، تا دڵی پڕیان خاڵی بكەنەوە.

نووسەران؛ هەندێجار شت گەلێك دەنووسن، كە هیچ كەس تێیان ناگا خۆیان نەبێ، هەندێجار بەدەم هەنسكی گریانەوە دەنووسن، بڕێ جار بە دەم پێكەنینێكی شێتانەوە. گەلێ جار لە خۆیان دەپرسن ئەرێ من بۆچی دەنووسم؟ بۆ كێ خۆم ماندوو دەكەم؟ شەونخوونیكردنم لە پای چی؟ جارجارەش هەست بە بێتاقەتی دەكەنو بە جۆرێ نائومێدی ڕوویان تێدەكات، كە ئاوات بە مەرگ دەخوازن!

**نووسەران؛ ڕاستە پەڕەی سپی، ڕەش دەكەن، بەڵام بەم هۆیەوە دەروونی هەزاران كەس سپی دەكەنەوە، پەردەی ڕەش لە بەرچاوی هەزاران خوێنەر هەڵدەماڵن، بەم ڕەشكردنە بینایی بۆ دڵە كوێرەكان دەگێڕنەوە!**

نووسەران؛ دەنووسن، تا بخوێنرێنەوە، دێنەگۆ، تا گوێیان لێ بگیرێت!

نووسەران؛ لە جیاتی میللەتێك دێنە گۆو قسە دەكەن، لە بری گەلێك فرمێسك هەڵدەوەرێنن، ئازاری ئەوان ئازاری میللەتێكە، داواكاری ئەوان داواكاری گەلێكە! ئەوان زمانحاڵی كۆمەڵگەنو دیاری سەر تەختی شانۆی ژیانن!

نووسەران؛ ئەوانەن، كە هەرگیز ئامادەنین بۆ بەرژەوەندیی تاكەكەسی خۆیان بنووسن، هەرگیز بۆ پارە پێنووس ناگرن بە دەستەوە، ملی پێنووسەكەیان بۆ ئەمو ئەو لار ناكەنەوە، ئامادەن حەقیقەت بخەنە ڕوو، ئەگەرچی سەروماڵو گیانیشیان لەو پێناوەدا لە مەترسی دابێت، ئەوانەن، كە بە خامەكانیان دژی ستەمو زوڵمو زۆرداری دەوەستنەوە!

نووسەران، ئەوانەن كە لە وتەو پەیڤەكانیاندا، پەیامی ئەرزشدار بوونی هەیە، ئامانجی هەرە لە پێشینەیان گرنگیدانە بە ناوەوەو ناخو ڕۆحو دەروونی مرۆڤەكان، لە ڕەوشتەكانیاندا نەرمی، میهرەبانی، ڕاستگۆیی، دەستپاكی، ئارامی!

نووسەران؛ هاوشێوەی مێشهەنگن، مێشهەنگ لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ دەگەڕێت، تا شیلەی گوڵەكان بمژێتو هەنگوینی شیرینمان پێشكەش بكات، نووسەرانیش بە هەمان شێوە دوای ماندووبوونێكی زۆرو دوای گەڕان بە نێو دەریای وشەدا، جوانترین پەیڤو ناسكترین وشەو بەهادارترین وتە دەخەنە بەر دیدەمان، تا تینوویەتیمان بشكێننو حەڵوای زیندەگیمان پێ نۆش بكەنو دەرك بە نهێنییەكانی ژیان بكەین!

نووسەران؛ ئەندازیاری ژیانن، پزیشكی جوانكاریی دەروونو دڵن، مامۆستای ڕەوشتی بەرزن، پاككەرەوەی ئەقڵن لە ژەنگو پیسی! خزمەتكاری دڵسۆزی ئەم گەلەن!

نووسەران؛ دوگیان دەبنو دواتریش ژان دەیانگرێت، ژانێك كە هیچی كەمتر نییە لە ژانی منداڵ بوون، هاوكات بەو ژانە بەرهەمەكانیان لە دایك دەبێت!

نووسەران؛ نووسینەكانیان بۆ هەندێك هیچەو بۆ هەندێكی تر بە سوود، بۆ هەندێكی تریش دەبێتە مەرهەمی زامەكانیان، دەبێتە ڕۆشنایی بۆ ژووره تاریكەكانیان، دەبێتە نیشاندەری ڕێگە لە بیابانی سەرلێشواوی ژیان، دەبێتە سوكنایی دڵە بیمارەكان، دەبێتە خەندەی لێوەكانیان، دەبێتە هاوڕێو هاوڕازیان!

نووسەران؛ خۆشترین كاتیان، ئەو كاتەیە كە یەكێ لە خوێنەری نووسینەكانیان، پەیوەندییان پێوە دەكاو دوای سوپاسو دەستخۆشی، باسی ڕۆڵو گرنگی نووسینەكانیان دەكات لەسەر گۆڕینی بیروباوەڕو ڕەوشتو تێگەیشتنی! ئەو دەمەیە كە دەزانن ماندووبوونیان بەزایە نەچووەو هەست دەكەن شتێكیان نووسیووە "هیچ" نەبووە! چون نووسەر هەیە دەیان پەڕە پڕدەكاتەوە بێ ئەوەی هیچ بڵێ، هەشە دێڕێكی كتێبێكە بۆ خۆی!

# بڕیار ٧

سەروەر عومەر

بڕیار، سەوزترین ئایەتە لە ئەندێشەی گەڵادا...
یادەوەریی زەریایی دڵۆپەیەکە، لە ئارامیی ڕووباردا...
هەستی گەشانەوەی کێڵگەیەکە، لە باوەڕی تۆودا...
بڕیـــار، باوەڕبـــوون بـــە زەریایە لە ئەندێشـــەی ماسییەکی نێو حەوزی شووشەدا...
ڕاڤەی ڕۆشنی ژیانە، لە ئاوێنەی عیشقدا...
بینینی ژیانە لە بەرگی پەلکەزێڕینەدا...
بەخشینی بزەیە بە لێوێکی وشکهەڵاتوو...
کانیاوێکە لە نیوەڕۆی بیابانێکی گەرمدا...
ڕازی درەوشانەوەی خۆرە....
لووتکەی پڕشنگی تریفەیە....
بڕیـــار، چەپکـــە گوڵی نێو دەســـتە، کـــە یار تا هەمیشە پێی مەستە....
تامی خۆشی ژیانە، جۆشو خرۆشی هاندانە... تێگەیشتن لە بوونە، هەنگاوی سەر ڕێگەی ئاسوودە بوونە...
بڕیار، خاوێنکردنەوەیماڵی دڵە لە گەردو غوباری خەم.
گوێڕادێرانـــە بۆ بانگی بەیانـــی، کە مژدەهێنەری سپێدەیە...
بڕیـــار، واتـــە: هەرچـــی هەیە، تامێکی خۆشـــی هەیـــەو ڕەنگێکی جوانـــی هەیە..بڕیار پێمان دەڵێت: ژیـــان جوانـــە، چاوەکانت بکـــەرەوە، پیاســـەیەك بە خانەباخەکانی ڕازدا بکە.

نیـــگات بە تەماشـــای یـــارەوە پەیوەســـت بکەو عەینەکی ڕەشـــبینی بشکێنە، لە ناخی جەستەکاندا، گیان ببینە.. دەرد فڕێ بدەو دەرمان ببینە.
بڕوانـــە لە چڵو پۆپی هەســـتەکان، گوێ بگرە لە نەغمەی خۆشـــی بەستەکان، ژیان جریوەی پڕ ئاوازی چۆلەکەکانە، ژیـــان باخی تەماشـــای یەزدانە، ژیان واتە: فڕینو فڕینو فڕین.. ژیان واتە: تریووســـکەی عیشـــقو یەقین، بڕیار ناخت پـــڕ دەکاتەوە لە ژیان، وشەکانی پڕن لە بۆنی باران...

# هەستی خوێنەران بۆ ساڵیادی بڕیار

بڕیار

بڕیاربێ ... لەگەڵ لێکردنەوەی دەنکە دەنکەی ئەو جۆ زەردانە، بڕیاریش وشە بە وشە دەریایەك لە میهروو خۆشەویستیتان بۆ بنووسێتەوە، لەبەردەم دیوەخانی (بڕیاردا)، هەشت مشت لە جۆی ئەم وەرزە دەڕێژین، تا باڵندە کۆچکردووەکانی ئەم وەرزە، کە گەڕانەوە یەکەم شوێن لە بەردەم دیوەخانەکەی (بڕیاردا) بحەسێنەوەو بڕیاربێ هەشت نەمامی ناسكو جوان لە باخەکەی بڕیاردا بچێنین، باخەکەی بڕیار، بێ پەرژینە! هەر کاتێك کە بیری گوڵت کرد، بێ دوودڵی یەکسەر وەرەو چەندت ویست بیبە.. بڕیاربێ، هەموو بەیانییەك، لەگەڵ جریوەی چۆلەکەکاندا، سروودی خۆشبەختیتان بۆ بچڕینو پەپوولەو گولاڵەی ئەودیوی پەرژینەکان، بێنە سەما لەگەڵیدا.. بڕیاربێ ئێوارانیش لە کاتی خۆر ئاوابووندا، بە شنەبایەکی هێواشدا، نامەیەکتان بۆ بنێرینو لێی بنووسین: «ئەگەر زۆر ماندوو بوویت، بێئومێد مەبە، خودای میهرەبان ئاگادارتە».. بڕیاربێ شەوانە بە دەم شەوقی مانگەوە، لاپەڕەکانی بڕیارتان بۆ ڕازاوەتر بکەین ... تۆش لە ساڵیادی بڕیاردا، لەگەڵ کرانەوەی یەکەمین گوڵەگەنم، خەندە بکە، ئاوازی ژیانی خۆت بژەنەو کام ڕەنگە زۆر نایابو جوانە، تابلۆی ژیانتی پێ ڕەنگ بکە.. بڕیاربدە چۆن جۆزەردان، بەرگی ئاڵتونی پڕ لە شەوقی پۆشی، تۆش ڕۆحت پڕ شەوقو نوور بکە، بڕیار بدەو دەست پێبکە، دەست بکەرەوە بەڕۆشتن بەو ڕێگایەی کە دەتگەیەنن بە ئامانجەکەت.. دەست بکەرەوە بە دانیشتن لەگەڵ ئەو مۆمەی شەوانە دایدەگیرسێنیت، تا شەوی تاریکت ڕوناك بێتو ڕۆحت پڕ لە نوورو عەقڵت فراوانتر بێت.. لەو شوێنەوە بڕیار بدەو دەست پێبکەرەوە، کە کۆتا جار تێیدا وەستایت!! لە هەشتەمین ساڵیادی گۆڤارەکەدا، پێشکەشە بە خوێنەرانی گۆڤاری بڕیار ... دەستخۆشی بۆ هەموو ستافی گۆڤارو خامەتان گوڵ بگرێت... زنە محەممەد سەعید

سڵاوێك لەکانگای دڵەوە، بۆ ڕێبوارە ماندوونەناسەکانی بڕیار.. حورمەت بۆ ئەو پەنجانەی هەستی دڵەپاکەکان دەنووسنەوەو دەیخەنە سەر پەڕەی بڕیار.. بەو نووسینە نوورینانە، ڕێزو بەهاو خۆشەویستیو بڕوا دەگەڕێننەوە بۆ دڵە بێنازو لانەوازو بێهیواکان، سەرلەنوێ ئاشقانیان ئاشنا دەکەن بەترووسکایی هیوای گەشی ژیان.. مژدەی هەلێکی دووبارە دەستپێکردنەوەی چەندجارە ماندوونەبوون لە هەرجارە دەچرپێنو دەیخەنە بەر دیدی خوێنەرە تینووە ماندوو ڕەنگهەڵبزرکاوەکانی نێو دنیا جەنجاڵەکەی خودپەرستە ڕەنگ کاڵەکانی زەمانە.. هیوای بەردەوامیتان بۆ دەخوازم، خوازیاربووم بەشێك بوومایە لە بڕیارو لە سەرکەوتنیو لە خزمەتکردنی .. بەبابەتو بڵاوکردنەوەو وەرگێڕان. نارین هاودیانی.

دەستخۆشیتان لێ دەکەم، بەڕاستی چ لەهەڵبژاردنی بەشەکانی گۆڤارەکەتاندا، چ لە هەڵبژاردنی بابەتەکاندا، زۆر سەرکەوتوون، بەتایبەت دیزاینو ڕەنگی وتەکانی ناوداران زۆر سەرنجڕاکێشن.. دووبارە دەستتان خۆش بێو بەهیوای سەرکەوتنو بەردەوامیتان.

محەممەد خۆشناو

بەڕێزو حورمەتەوە لە کاری ئێوە دەڕوانم، بەڕاستی لە ڕابوردوودا چاکتان کرد! خۆشەویستیو وشەی جوانتان بەخشییەوە، بە پەنجەی نەرمتان، دەرگای دڵە داخراوەکانتان کردەوە، بەئارامیو وشەی ناسك، دڵسۆزیتان چپاندە بنگوێی لەپێکەوتووەکان؛ بۆئەوەی هەستنە سەر پێ، باسی باوەڕبەخۆبوون، ڕێزگرتن، بەرنامەو پلانتان هێنایە گۆڕێ، بەڕاستی چاکتان کرد! بۆ داهاتووش خودای گەورە یارو پشتیوانتان بێت، چاوەڕێی سەرەتای مانگین بۆ ژمارەیەکی نوێ..

جەلال عەبدوڵڵا حاجی

سڵاو بەڕاستی گۆڤاری بڕیار، یەکێکە لەو بڵاوکراوانەی کە کاریگەریی زۆری لەسەر ژیانم کرد، بەشێوەیەك لە کەمترین کاتدا زۆرترین سوودی پێ بەخشیم. بەهۆی بابەتە هەمەڕەنگەکانییەوە زیاتر بیرو هۆشی منی بۆلای خۆی ڕاکێشا، هەمیشە لەگەڵ نوێدا بووە، کە ئەمەش خواستی منە، هیودارم لە هەشتەمین ساڵیادی بڕیارەوە، بابەتی سەرنجڕاکێشتر ببینینو سەرسامان بکات. هیوای سەرکەوتنی گەورەتان بۆ دەخوازم؛ چونکە سەرکەوتنی ئێوە سەرکەوتنی چەندانی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، داوا لە خودای گەورە دەکەم پشتو پەنای هەموان بێت، زۆر سوپاس. عەزیز عەلی

گۆڤاری بڕیار جێدەستو پانتایی خۆی لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا کردۆتەوەو ڕەگو ڕیشەی لە دڵو ناخی عەودالانی ڕێگای ڕاستو نووریندا داکوتاوە؛ چونکە یەکانگیرە لەگەڵ پەیامەکەیداو هاوتەریبە لەگەڵ ئامانجەکەیداو ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای تاکەکانەو ماندوونەناسانە تێدەکۆشێت لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا..

موحسین ئیسماعیل پشدەری

سڵاوێکی نەرمو دەستی ماندوونەبوونی یەك یەکی ئەندامەکانتان دەگوشم، ستافەکەتان وەك باخچەیەو هەر کارمەندێك وەك گوڵێکە لەو باخچە خنجیلانە، بۆنی گوڵاوتان ماڵ بە ماڵی کوردستانی گرتۆتەوە. هیوام بەردەوامیتانەو بەرەو باشتر هەنگاو بنێن لە ساڵی تازەی نووسینتان، ساڵی نوێی ئەم شانە هەنگوینەش پیرۆز بێت.

باخان حەسەن

لەم ڕۆژگارە دژوارو پڕ کێشەو نیگەرانییەدا، چەند خامەیەك، چەند بیرێکی ڕۆشن، کە هەر یەکەو ڕەنگێکو ئایدیایەکی جوان، بەوپەڕی لە خۆبوردەییەوە بە هەستو بیری جوانیان بەرەنگاری هەموو نیگەرانییەکانیان دەبنەوەو هیواو جوانیمان بۆ دەگێڕنەوە، لە باخە بۆنخۆشەکەی بڕیار، خۆم زۆر بە خۆشحاڵ دەزانم، کە پیرۆزباییو دەستخۆشیم ئاڕاستەی ئێوەی زۆر دڵسۆز بە نیشتمانو مرۆڤایەتی بکەم، بە بۆنەی تێپەڕبوونی (حەوت ساڵ) خزمەت.. بە هیوای بەردەوامبوونتان.

ڕۆشنا خەلیل

کاتێك سەرەتا ئەوگۆڤارەم بینی هیچ گرنگییەکم پێی نەدەدا؛ چونکە نەمدەزانیماناو گرنگیی وشەی بڕیار چییە، تا ڕۆژێك گوتم با گۆڤاری بڕیار بکڕم کاتێك دەستم کرد بەخوێندنەوەی، لە پەڕەی یەکەم تا دوا پەڕە، هیچیانم لێ فوتار نەکرد، هەموویم خوێندەوەو بووم بە خوێنەری بەردەوامی بڕیار، کە بیستی مانگ دەردەچوو، بیستو دوی مانگ چاوەڕێی ژمارەی نوێم دەکرد، بەڵام هێشتا لە مانای وشەی بڕیار نەگەیشتبوومو هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو وشەیە، بۆ گۆڤارێکی ئەوها مەزن، نەمدەزانی تا گەیشتمە پەیمانگا، ئەو کات تێگەیشتم کە گرنگترین شت لە ژیانی مرۆڤدا، بڕیاردانە.. ئەوکات زانیم کە بۆچی ئەو ناوە هەڵبژێردراوە بۆ ئەو گۆڤارە مەزنەو زیاتر گرنگیم بە گۆڤاری بڕیار داو لام شیرینتربوو، لەو ژمارەیەشی کە یەکەمجار کڕیومە، تا دواین ژمارە، لای من ئەرشیفکراوەو هەڵمگرتووە.

محێدین محەممەد

دەستان خۆش بێت، سەرکەوتن بۆ ئێوە، بڕیاری گەل وەسفتان ناکرێت، وشەکان لەئاست ئێوەدا ڕادەمێنن، دەستەوەستانو لە بەرامبەر ئێوەدا چۆك دادەدەن، بژین ستافی بڕیار، بمێنن بۆمان، پەیوەستین بە ئێوەوە لەبەر ئێوە ئارەزووی تەمەندرێژی دەکەین.

سەفین سەرتیپ

گۆڤاری بڕیار، یەکێکە لەو گۆڤارە زۆرباشانەی کە کار لەسەر عەقڵی تاکی کوردی دەکات؛ بۆئەوەی بە ڕوئیاو دوونیابینییەکی جوان، سەیری ژیان بکەنو کار لەسەر وەخەبەرهێنانی تواناو وزە شاراوەکانی تاکی ئێمە دەکات. بڕیار مرۆڤەکانی ئێمە فێردەکات؛ ئەگەر کارێك کەسانی تر ناتوانن ئەنجامی بدەن، فێربووین کە دەتوانین ئێمە ئەنجامی بدەین، بەڵام گلەییەك لە گۆڤاری بڕیار، چەند ژمارەیەکی باش لەو گۆڤارە نووسیم، دواتر بەردەوام بووم، لەبابەت ناردن، بەڵام بڵاوتان نەدەکردەوە، تکایە هەر وەك چۆن کار لەسەر بونیادنانی ئینسانی ئێمە دەکەن، توانای قەڵەمە بەبڕشتەکان مەکوژن، لەگەڵ ڕێزم بۆستافی گۆڤار..

شەیدا سابیر/ قوتابی ماستەر تورکیا

بەڕاستی من دەستخۆشی خۆم لە سەرنووسەری گۆڤارو ستافو بەڕێوەبەری گۆڤارەکە دەکەم، بە ڕاستی توانیویەتی بۆشاییەك، لە بەرەو پێشبردنی ئەقڵییەتی تاکی کورد پڕ بکاتەوە، بڕیار وات لێ دەکات بە متمانەبەخۆبونێکی زۆرەوە بڕیار لەسەر داهاتووی خۆت بدەیت.

ئەسما محەممەد

من هەرچیم کرد، نەمتوانی شتێکی وا بنووسم، کە شایستەی ئەو خزمەتەی ئێوە بێت، من خوێنەری بەردەوامی گۆڤارەکەتانم، خودای گەورە سەرفرازو سەرکەوتووتان بکات، تەمەندرێژبن، هیوادارمساڵیادی بڕیار ببێتە هۆی گۆڕان لە ژیانی هە موو تاکێکماندا.

گەردوون بەهرام

تاکە گۆڤارە لە کوردستان، کە جێی خۆی لە دڵی هەمواندا کردووەتەوە، بە گەنجو پیرەوە.

نوسەیبە ئەحمەد

بیرمە یەکەم ژمارەی بڕیار، کە دەرچوو، ساڵی ٢٠٠٨ بوو، ئەوکات ماڵمان لە ناحیەی عەربەت بوو، منیش تەمەنم ١٤ ساڵ بوو، کتێبخانەیەکی بچووك لەسەر سووچی کۆڵانەکەماندا هەبوو، زۆر کات دەچووم بۆ ئەوێ، گۆڤارو ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، بەهۆی باری ئابووریمانەوە، کە کەمێك لاواز بوو، نەمدەتوانی بیکڕم، هەر لەوێ دەمخوێندەوە، کە گۆڤاری بڕیارم بینی، زۆر حەزم دەکرد بیخوێنمەوە، بەڵام خرابووە ناوو زەرفەوە، خاوەن کتێبخانەکە، دەیگوت: دەبێت بیکڕیت، بەڵام من پارەم نەبوو، ئێستاش خەم دەخۆم، کە نەم توانیوە بیکڕمو سوود لە بابەتەکانی وەربگرم بەداخەوە.. بەڵام خۆشبەختانە لە دوای ساڵی ٢٠١٢وە هەموو ژمارەکانیم کڕیوە..وەك ئەرشیف هەڵم گرتوون.. نازانم بۆچی ئەم نامەیەم نووسیو بۆ ئێوەم نارد، بەس زۆر دەمێکە حەزم دەکرد بە کەسێکی بڵێم.

کامەران محمد




# پیتەر لینچ ١٩٤٤-....

**له هەر شوێنێك كارێكی سەركەوتووت بینی، ئەوە مانای وایە كەسێك لەو شوێنەدا بڕیارێكی نازایانەی داوە.. پیتەر دراكر**

"پیتەر لینچ" لە ساڵی ١٩٤٤ لە ویلایەتی بۆستن لەدایكبووە، باوكی ناوی (تۆماس)ەو پرۆفیسۆری بواری ماماتیك بووە، لە هەمان كاتدا كارمەند بوو لە كۆمپانیای جۆن هانكۆن بۆ دڵنیایی، پیتەر تەمەنی نەگەیشتبووە (١٠) ساڵان، كە باوكی ماڵاوایی لە ژیان كردو پیتەری بۆ هەمیشە بەجێهێشت، دایكی پیتەریش ئافرەتی ماڵ بوو، یەكەم جار كە گوێبیستی كاغەزی دراو بوو، ئەو كاتە بوو كە وەكو كرێكارێك لە جۆرج سولیڤان بۆ كەلوپەلی گوڵف كاری دەكرد.

پیتەر لە خوێندنو كاركردن بەردەوام بوو، تا ساڵی ١٩٦٣ كە ئەو كات خوێندكاری قۆناغی دووەمی كۆلێژ بوو، یەكەم پشكی لە كۆمپانیای فلاینگ تایگەر كڕی، ئەم بڕیارەی پیتەر بووە سەرەتای سەركەوتنی لە بواری بازرگانیدا، كڕینی پشكەكەی تایبەت بوو بە كۆمپانیای فڕۆكەوانی، بازرگانی گواستنەوەی ئاسمانی پێشكەوتنێكی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، نرخی پشكەكەی بۆ پێنج هێندە بەرزبووەوە، هۆكارەكەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو گرێبەستی گواستنەوەی سەربازانی ئەمریكی بۆ ڤێتنام، ئەم قازانجەش سوودی بە پیتەر گەیاند، بۆ دەستەبەركردنی بڕی تێچووی خوێندنەكەی..

ساڵی ١٩٦٩ توانی بەسەركەوتوویی كۆلێژ تەواو بكاتو بڕوانامەی بەكالۆریۆس بەدەست بهێنێت، دواتر دەستی كرد بە خوێندنی باڵا لە كۆلێژی وارتۆن..

**دوای ساڵێك لە تەواوكردنی كۆلێژ لە وارتۆن، كە یەكێك بوو لە دە یەكەمینەكانی كۆلێژەكەی، بیرۆكەی دامەزراندنی بازاڕێكی ئەكادیمی بۆ هات، گەیشتە ئەو بڕوایەی كە ئەوەی لای وەبەرهێنەرانی فیدڵتییە، لە بازاڕەكانی ئاوڕی لای ئەكادیمییەكان فراوانترە،** پیتەر لینچ هەر لەو ساڵەدا هاوسەرگیری لەگەڵ (كاریلون هوف)ئەنجام دا، كە چارەسازێكی فیزیایی بوو، خودا سێ كچی پێبەخشین، دواتر پیتەر بۆ ماوەی دوو ساڵ پەیوەندی كرد بە ڕیزەكانی سوپاوە، پلەی ئەفسەری بەدەست هێنا، لە بواری تۆپخانەدا، لەو ماوەیەدا لە ویلایەتی تەكساسو كۆریا خزمەتی كردووە.

دواتر لینچ لە ساڵی ١٩٦٩ چووە پاڵ فیدلتیو وەكو شیكاری كانزایی دەستی بەكاركردن كرد، دوای پێنج ساڵ پلەی بەرزبووەوەو بووە بەڕێوەبەری توێژینەوە لە فیدڵتی.

- لە ٣١ ئازاری ساڵی ١٩٧٩ بووە سەرپەرشتیاری ئیدارەی مەنەیجمێنت فاند، ئەو كاتەی سندووقی پاشەكەوتی ٢٠ ملیۆن دۆلارو ٤٠ پشك بوو، سەرەتا دەستی كرد بە كڕینی چەند پشكێك، تا ئەوەی توانی ببێتە خاوەنی ١٥٠ پشك، لە پیشەسازی پاشەكەوتو قەرزەكان، پشكی قازانجی ئەو سندووقە گەیشتە ١١،٦٪ لە كۆتایی ئەو ساڵەدا، بەرامبەر بە ٤٠،٣٨٪ زەرەروزیان.

لینچ بۆ یەكەمجار بلاكوینتا متور ئینزی بیستبوو، بەڵام دواتر بووە یەكێك لە وەبەرهێنەرە باشو لێهاتووەكانی ئەو

بواره، كاتێك دەستی كرد بەم كاره یەكەم ئامۆژگاری كه پێی گەیشت بەڕێوەبەری هۆلیدای كه پێیگوت، كه لاكوینتا كار له رووخانی هۆلیدای دەكات، له هیوستن، لینچ به وتەكانی جەنابی بەڕێوەبەر سەرسام بوو، له كاتێكدا كه شێوەی كارو پاشەكەوتی لاكوینتا هاوشێوەی كارو پاشەكەوتی هولیدایه، بەڵام به نرخێكی هەرزانتر به ڕێژەی له سەدا ٣٠٪ له كۆی نرخی كۆتایی.

باڵانسی ماجیلان به شێوەیەكی تەدریجی له ماوەی چەند ساڵێكدا یەكجار بەرزبووەوە.

دواتر لینچ گرنگی دا به كۆمپانیای فۆرد بۆ ئۆتۆمبێل، كه پشكەكانی خۆی دەفرۆشت به بڕی ٤ دۆلار بۆ هەر پشكێك، لەبەرئەوەی باڵانسی كۆمپانیای... یەكسان بوو به بڕی ٨،٢٥ ملیار دۆلار، شێوەی قەرزیشی بۆ ماوەیەكی درێژ بوو، ئەمەش خاڵێكی پۆزەتیف بوو، له كۆتایی ساڵی ١٩٨٨ ماجیلان نزیكەی پێنج ملیۆن پشكی له كۆمپانیا فۆرد كڕی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كه قازانجێكی خەیاڵی بەدەست بهێنێت، بەتایبەت كاتێك نرخی هەر پشكێك له چوار دۆلارەوە بەرزبوەوە بۆ ٣٨ دۆلار، لەو كاتەدا زۆرێك له لێكۆڵەرەوەكان لەو بڕوایەدا بوون، كه لینچ ئەو پشكانە دەفرۆشێت، بەڵام لینچ پارێزگاری له پشكەكان كردو ئەمەش بووە هۆی بڕێكی یەدەكی زەبەلاح بۆ حەوزەی كۆمپانیاكەی، تا دواجار نرخی پشكەكان بۆ له ٤٠٪ بەرزبووەوە، هەروەها لینچ بڕێكی زۆری له كرایزلر بەدەستهێنا، كاتێ توانی ئەو كۆمپانیایە له خەتەرێكی گەورە ڕزگار بكات، وەكو كۆمپانیایەكی چالاكو لێهاتوو بیخاتە گەڕو ببێتە خاوەنی ئۆتۆمبێلی نوێو سەرنجڕاكێش، "مینی فان"، دواتریش دەركەوت كه سەرجەم پێشبینییەكانی ڕاستو دروست بوونو كرایزلەر بووە گەورەترین وەبەرهێن.

له ٣١/كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٨٣ ماجیلان بووە خاوەنی گەورەترین سندووقی پاشەكەوت له جیهاندا، به شێوەیەك كه رەصیدەكەی گەیشتە ١،٦ ملیار دۆلار، پاشەكەوتی سندووق گەیشتە ٣٨،٦٪، هەندێك له لێكۆڵەران هەستیان به نیگەرانیو دڵەڕاوكێ كرد، چونكه بەڕێوەبردنی بڕی زیاتر له یەك ملیار دۆلار بۆ ئەو سەردەمە زۆر قورس بوو، بەڵام لینچ بەلایەوە ئەستەم بوو كه واز له كڕینی پشكەكان بهێنێت له ترسی چۆنێتیی بەڕێوەبردنیان، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداریكردن كه خولیاو ئاواتەكانی ماجیلان بەدی دەهێنرێتو دەتوانێت دەست بەسەر زۆرینەی بازاڕدا بگرێت.

دواتر باڵانسی ماجیلان بۆ پلەیەكی یەكجار بەرز زیادی كرد، بەمشێوەیەی خوارەوە:

١- ساڵی ١٩٨٤ باڵانسی ماجیلان گەیشتە ٢،٠٠٪ .

٢- ساڵی ١٩٨٥ پاشەكەوتی ماجیلان گەیشتە ٤٣،١٪ باڵانسەكەشی گەیشتبووە ٤،١ ملیار دۆلار.

٣- ساڵی ١٩٨٦ باڵانسی ماجیلان گەیشتە ٢٣،٧٪ كه بڕەكەی دەگەیشتە ٧،٤ ملیار دۆلار.

٤- ساڵی١٩٨٧ باڵانسی ماجیلان گەیشتە ١٠٠٪ كه بڕەكەی دەگەیشتە ٧،٨ ملیار دۆلار.

دواجار له تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٨٧ بازاڕی پشكەكان به جارێك هەرەسی هێنا، بەهۆی ئەوەی هەندێك له وەبەرهێنەرەكانی ماجیلانو هەندێك لەوانەی پشكەكانیان كەم ببووەوە، بۆ ڕێژەی له ٣٪، پارەكانیان له سندووقە ڕاكێشایەوە، بەڵام ئەوەی ئاشكرابوو ئەوە بوو كه هەموو وەبەرهێنەرەكانی دیكە، كاریان به ئامۆژگارییەكەی ویلش دەكرد، كه بریتی بوو لەوەی هەمیشە له سندووقدا كاری وەبەرهێنان بكەن، بۆ كاتێكی دوور مەودا، لەگەڵ ئوەشدا جووڵەو گۆڕانكارییەكانی بازاڕ فەرامۆش بكەن، چونكه بۆ ماوەیەكی كورتە ئەو گۆڕانكارییانە.

- له ساڵی ١٩٨٨ نازناوی نوێنەری كۆلێژی بۆستنی لێنرا، لەو ساڵەدا باڵانسی ماجیلان گەیشتە ٢٢،٨٪ .

ساڵی ١٩٨٩ باڵانسی ماجیلان گەیشتە ٣٤،٦٪.

لینچ كتێبێكی بەناونیشانی (one up on wall street) بڵاوكردەوە.

له ٣١ ئایاری ساڵی ١٩٩٠ پیتەر لینچ دەستی هەڵگرت له بەڕێوەبردنی ماجێلان فاند، خۆی خانەنشین كرد هەرچەندە هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی خانەنشینی، كه ئەو كات تەمەنی تەنها ٤٦ ساڵ بوو، بەڵام هۆكارەكەی گەڕاندەوە بۆئەوەی كه كاتی زیاتر تەرخان بكات بۆ خێزانو منداڵەكانی؛ بۆئەوەی گرنگی به پێداویستییەكانی ئەوان بدات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كه باڵانسی سندووق بگاتە چواردە ملیار دۆلار، زیاتر له یەك ملیۆن پشك.. ئەمەش واتە هەر وەبەرهێنێك بڕی ١٠٠٠٠ دۆلاری هەبوو، له كاتێكدا كه ئەو ڕۆژەی لینچ بەڕێوەبردنی ماجیلانی جێهێشت، گەیشتبووە ٢٨٠٠٠٠ دۆلار.

ساڵی ١٩٩٣ كتێبێكی بەناونیشانی (Beating the street) بڵاوكردەوە، كه له ماوەی هەشت هەفتەدا له گۆڤاری نیۆرك تایمز به یەكێك له كتێبە پرفرۆشترینەكان دیاری كرا، هەروەها خەڵاتی كۆمەڵەی ماساشوستس بۆ ڕێگریكردن له بەكارهێننی توندوتیژی دایك دژی منداڵ بەدەست هێنا.

-ساڵی ١٩٩٤ وەكو ڕێزێك بۆ هەوڵو ماندووبوونەكانی ئەو كۆلێژەی تێیدا پلەی بەكالۆریۆسی بەدەست هێنابوو، واتە كۆلێژی وارتۆن، به دیارترین دەرچووەكانی كۆلێژ دیاری كرا.

ساڵی ١٩٩٥ بەشداری له دانانی (Leam to Eam)دا كرد، كه ڕێبەرێك بوو بۆ ئەو كەسانەی سەرەتایانە له بواری وەبەرهێنانو بازرگانیدا.

- ساڵی ١٩٩٧ پەیكەیەكی چەسپێنراوی بەرهەم هێنا (the stock shop)، كه پێكهاتبوو له كەلوپەلی گەڕان كه وەبەرهێنەرەكان دەیانتوانی بەكاری بهێنن، ئەوانە كه حەزیان دەكرد لەناو جانتاكانیاندا پارەكانیان هەڵگرن.

- له ساڵی ٢٠٠٠ كۆلێژی زانست له زانكۆی بۆستن ناونرا كۆلێژی لینچ بۆ فێربوون، وەكو دەربڕینی سوپاسو پێزانینێك بۆ ئەو بەخشینەی كه پیتەر لینچ پێشكەشی زانكۆكەی كردبوو كه بڕەكەی ١٠ ملیۆن دۆلار بوو.

- له ساڵی ٢٠٠٤ ئەو سندووقەی كه لینچ سەرپەرشتی دەكرد، زیاتر له پێنج ملیۆن دۆلاری بەخشی به پێنج هەزار فێرخواز بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠٠٣-٢٠٠٤، هەروەها توانی ٥٥ ملیۆن دۆلار بۆ ٤٥٠٠٠ فێرخواز كۆ بكاتەوە.

ئەو بڕەی دامەزراوەكەی لینچ بەخشیویەتی به ١٢٥ ملیۆن دۆلار مەزندە دەكرێت، كه بەسەر دەزگاكانی فێركردنو ڕێكخراوە ئاینییەكانو ڕێكخراوە ڕۆشنبیریو مێژووییەكانو نەخۆشخانەكانو توێژینەوە پزیشكییەكاندا دابەشی كردووە.

جەلال عەبدوڵا حاجی

# سەرچاوەی کێشەکە کێیە..!؟

## بەشی دووەمو کۆتایی

بۆ ڕزگاربوون لە خۆڵو خاشاك، سێ قۆناغی سەرەکیمان هەیە، بە (3R) ناودەبرێت:

کەمکردنەوە (reduce) بەکارهێنانەوە، (Reuse)، لەنوێ بەکارهێنانەوە (Recycle) ..

١- کرداری کەمکردنەوە (Reduce): واتە: کەمکردنەوەی ئەو مادانەی دەبنە هۆی پیسبوونی ژینگە، کاتێك لەبازاڕ سەوزەو میوە دەکڕیت، هەوڵ بدە کەمترین کیسەی نایلۆن ببەیتەوە بۆ ماڵەوە، چونکە ئەوەی لەبازاڕ دەیکڕینو دەیبەینەوە بۆ ماڵەوە، دواجار دەبێت فڕێ بدرێت، دەتوانیت کیسەی قوماش، یان کاغەز بەکاربهێنیت، کیسەی نایلۆن سەرچاوەیەکی سەرەکی پیسبوونی ژینگەیە، بەئاسانی با دەیگوازێتەوە، دیمەنێکی ناشیرین بە ژینگەی سرووشتی دەدات، تەنانەت ئەو خۆراکەشی دەیکڕین بەشێکی بەبێ بەکارهێنان فڕێ دەدرێت، هەندێجار دەکاتە یەك لەسەر سێی خۆراکەکە، بەهۆی زۆری خۆراكو مانەوەی بۆماوەیەکی زۆر خراپ بەکارهێنانی خواردنەوە بەشێکی زۆری فڕێ دەدرێت، خۆراکی تەڕ هۆکاری بۆن ناخۆشی خۆڵو خاشاکە، خۆت بەدوور بگرە لە خۆراکی ئامادەکراو لە قوتوونراو، لەڕووی تەندرووستیەوە باش نییەو بەقوتوو کیسەکەی ژینگە پیس دەکات. (هێندە بکڕە کە بەکاری دەهێنیت).

٢- کرداری بەکارهێنانەوە (Reuse): ئەو کەرەستەو پێداویستیانەی فڕێ دەدرێن، دەتوانرێت سوودی لێوەربگیرێت، ئامێرێکی لەکارکەوتووی کارەبایت هەیە، فڕێی مەدە چاکی بکەرەوەو بەکاری بهێنە، یان بیبەخشە بە کەسێکی تر، کاری دەستڕەنگینی بکە، لە قوتوی کانزاییو دەبەی پلاستیك کەرەستەی سادەو جوان درووست بکە، مەرج نییە هەموو پێداویستیەك لە بازاڕ بکڕیت، دڵنیابە کاتێکی خۆش بەسەر دەبەیت، منداڵان زۆر حەزیان بەم کارەیە، هاوبەشییان پێ بکە، تایەی بەکارهاتووی ئۆتۆمبێلەکەت گوڵو نەمامی تێدا بڕوێنە، لە ئینتەرنێتدا بە دوای کاری دەستیدا بگەڕێ، لە مۆبایلەکەتدا ئەم وشەیە بنووسە (DIY projects)، چەندین بەرنامەی جوان هەن لەبارەی کاری دەستیو بیرۆکەی قەشەنگ بۆسەر مۆبایل، دڵنیام شتی جوانو سەرنجڕاکێش درووست دەکەیت، ئارامی بەناخت دەبەخشیتو یارمەتیی ژینگەکەشمان دەدەیت. کیسەی نایلۆن کۆ بکەرەوەو فڕێی مەدە، دەتوانیت بیدەیتە دەست سەوزە فرۆشێك؛ بۆئەوەی بەکاری بهێننەوە.

٣- کرداری (لەنوێ بەکارهێنانەوە) Recycling: مرۆڤی ژینگەپارێز کەسێکە لە خەمی خۆیو خەڵکو نەوەی داهاتوودایە، ژینگەپارێز کەسێکی هۆشیارو ڕۆشنبیرە، ئێمە دەبێت لە هەوڵی ئەوەدابین کەمترین خۆڵو خاشاکمان هەبێت Zero waste کاتێك خاشاك کەم بووەوە کرداری ڕیسایکلین ئاسان دەبێت، لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بە کرداری ڕیسایکلین کرد (لە نوێ بەکارهێنانەوە)، کردارێکە بۆ ڕزگارکردنی ژینگە لە خۆڵو خاشاك بەشێوەیەکی زانستی، ڕێگایەکی باشە بۆ بەرهەمهێنانی وزەو دەستکەوتنی گەلێك مادەی خاوی وەك کاغەز، ئەلەمنیۆم، شوشەو ئاسن، زۆرجار گلەیی ئەوە دەکرێت بۆچی خۆڵو خاشاك ڕیسایکلین ناکرێتەوە!؟ لێرەدا دەمانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە: ئایا بەدانانی کارگەی ڕیسایکلین کێشەی خۆڵو خاشاك کۆتایی دێت؟

ڕەنگە بتوانرێت ڕێژەیەك لە خۆڵو خاشاکی ماڵانو کارگەکان ڕیسایکل بکرێتەوە، بەڵام ئەمە چارەسەری سەرەکی نییە، لە ئەنجامی پێشکەوتنی پیشەسازیو ئابووریو کۆمەڵایەتی، شێوازی ژیانی ئێمەش گۆڕاوە، ئەمەش هاوتەریبە لەگەڵ گرفتی پیسبوونی ژینگەدا، تا دێت بەکاربردنمان زۆرتردەبێت، بیرکردنەوەمانو عەودالیمان بەدوای خۆشبەختیو ئارامیدا، وای کردووە کەرەستەو ئامێرێکی زۆر لە خۆمان کۆ بکەینەوە، ئەگەر تائێستاش کۆمان نەکردبێتەوە، ئەوا لەبەرنامەی زۆرینەماندایە لە داهاتوودا لە خۆمانی کۆ بکەینەوە. نەبوونی هۆشیاری ژینگەیی، هەروەها نەبوونی پێشینەیەك لەم بوارەدا، کرداری (ڕیسایکلین) قورستر دەکات، ئەم کارە پێویستی بە هەموومانە؛ بۆئەوەی سەرکەوتووبێت، جاران بە کۆڵانەکاندا خەڵکانێك دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەی پێڵاوی لاستیك، فافۆنو مس، بەرامبەر بە بنێشتی کوردی، یان بڕێك پارە، لەبەرئەوە منداڵان پێڵاوی لاستیکیان کۆ دەکردەوە، بەم شێوەیە ڕاستەوخۆ بەشدار دەبوون لە پاراستنی ژینگەدا، دواتر ڕیسایکل دەکرایەوەو پێڵاوی لاستیکی لێ درووست دەکرا، ڕاستە ئێستاش هەمان کار دەکرێت، بەڵام منداڵان بەشدار نین لە کارەکەدا، هەروەها تێکەڵی هەمەجۆری ماددەکان، کرداری ڕیسایکلین قورستر دەکات.

بۆئەوەی یارمەتیی ژینگە بدەین، دەبێت هێندە خۆراك بەکار بهێنین فڕێ نەدرێت، زیادڕۆیی نەکەین، زیاد لەپێویست نەکڕین، چونکە سەرچاوەی کێشەکە ئەو کیسانەن کە لە بازاڕ پڕ دەکرێنو دەهێنرێنەوە بۆ ماڵەوە، بۆمان دەردەکەوێت بیرکردنەوەی ئێمەو شێوازی ژیانی ئێمەیە، کە بڕی خۆڵو خاشاك دیاری دەکات.

ئایا ئەو کەرەستانەی دەیکڕینو ماڵەوەمانی لێ پڕ دەکەین، پێویستن؟! ئایا سەرچاوەی ماددیی کەسێك باش بوو، دەبێت کەلوپەلی ماڵەوە بەخێرایی بگۆڕێت؟





# ئۆپرا وینفرەی

ئالانی

## (١٩٥٤ - ....)

کاریگەریی ئۆپرای لەسەر خەڵکی‌و ڕۆشنبیرییان لەسەرو کاریگەریی زانکۆ بووە بەسەر خەڵکییەوە، هەروەها دەتوانین بڵێین تەنانەت کاریگەری لە خودی سەرۆکی ئەمریکاش زیاتر بووە، یان هەر کەسایەتییەکی سیاسی، سەربازیی، بەم وشانە گۆڤاری فاینی فیری ئەمریکی وەسفی خاتو ئۆپرای کردووە!

خاتوو ئۆپرای ئافرەتێکی ڕەشپێستە، چۆن توانی بگاتە سەروو سەرۆکی ئەمریکاو لە ڕووی کاریگەری لەسەر گەلی ئەمریکاوە؟ چۆن توانی وابکات کە بەرنامەکەی زیاتر لە سەد دەوڵەتی جیهان پەخش بکرێ‌و بینەرێکی زۆر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، چی ئەم خاتوونە ڕەشپێستەی جیاکردەوە کە لە گەڕەکێکی هەژارنشین‌و تاریک‌و پڕ ستەم‌و چەوسانەوە، بگاتە یەکێك لە بەناوبانگترین‌و دەوڵەمەندترین ئافرەتی جیهان؟

بۆئەوەی بزانین خاتوو ئۆپرای چۆن گەیشتە ئەو ئاستانە، تیشکێك دەخەینە سەر ژیاننامەو دەستکەوتەکانی‌و سەرکەوتنەکانی‌و کۆسپەکانی ڕێگەی ئەم خاتوونە.

خاتوو ئۆپرای لە ساڵی ١٩٥٤ لە کۆسیکۆ لە ویلایەتی مسیسیپی لەدایکبووە، باوکی ناوی فیرنیتالی ونیفرەیە کە سەربازی سوپا بووە، دایکی سەرەتا ویستویەتی ناوی بنێ ئوربا، بەڵام بە هۆی هەڵەی ڕێنووسییەوە لە کاتی تۆمارکردن نوسراوە ئۆپرا.. دواتر ئۆپرا بووە ناوی هەمیشەیی بۆ ئەم خاتوونەو هەر بەو ناوەوە ناوبانگی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو چەندین دەوڵەتی تێپەڕاند.

هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە دایکی ئۆپرا لای نەنکی جێ دەهێڵێت‌و بە مەبەستی کارکردن دەڕواتە کێلگەیەکی

کشتوکاڵی لە ویلایەتی مسیسیپی، ئیدی ئۆپرا دوور لە سۆزی دایکی تەمەنی منداڵی بەڕێ کرد، بەڵام داپیرەی نازی ئۆپرای دەکێشاو پەروەردەکردنو فێرکردنی لە ئەستۆ گرت، داپیرەی فێری خوێندنەوەی کرد، بەڵام هیچ ناتوانێت شوێنی دایك بۆ منداڵ بگرێتەوە، لەبەرئەوە ئۆپرای لە ساڵی ١٩٦٠ لە تەمەنی شەش ساڵیدا ڕۆیشت بۆ لای دایکی لە میلوکی، دوای دوو ساڵ مانەوەی لە ئامێزی دایکیدا، دووبارە کۆسپێکی دیکە یەخەی ئۆپرای گرتەوە، ئەوەبوو دایکی لەبەر کەمدەرامەتی نەیتوانی ئۆپراو خوشکە بچووکەکەی باتریشیا بەخێو بکات، لەبەرئەوە ناچار بوو کە دووبارە ئۆپرای بنێرێتەوە بۆ لای باوکی، کە ئەو کات باوکی سەرقاڵی کارگوزاریو پاککردنەوەی زەویوزار بوو، لەبەرئەوەی باوکیشی نەیتوانی پەروەردەکردنیان بگرێتە ئەستۆ، دووبار ئۆپرا گەڕایەوە لای دایکی، ڕۆژەکان تێپەڕین، ژیانی ئۆپراو خانەوادەکەی لێوانلێو بوو لە هەژاریو نەداریو دەردەسەری، لە هەموو کارەسەتەکانیش گەورەتر، جیابوونەوەو دابڕانی دایكو باوکی بوو لە یەکتری، ئۆپرای تەمەنی گەیشتە چواردە ساڵان، دوچاری ڕووداوێکی نەخوازراوو ناهەموار بووەوە لەلایەن یەکێك لە خزمە نزیکەکانییەوە، دووبارە ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی ڕابکاتو ماڵی دایکی جێ بهێڵێتو جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ لای باوکی، تا تەمەنی بیستو دوو ساڵی لەلای باوکی مایەوە.

بەڵام ئەو کاتەی ئۆپرای لە ناوەندی دەیخوێند، وەکو بێژەرێك بەشداری کرد لە هاندانی بەشداربووانی ماراسۆنی ڕێڕۆیشتنی دایمز، لەو کاتەدا دەگات بە بەڕێوەبەری کەناڵێکی ناوخۆیی کە بە دوای کارمەنددا دەگەڕا، تا تاقێك دەوام لە کەناڵەدا بکەن، بەڕێوەبەر زۆر بە دەنگی ئۆپرا سەرسام دەبێت، لەبەرئەوە داوای لێدەکات کە وەکو بێژەرێك لە کەناڵەکەیان کاربکاتو هەواڵەکانی ڕۆژانەیان لە ڕۆژانی پشووی هەفتەدا بۆ بخوێنێتەوە، لە بەرامبەردا هەفتەی سەد دۆلاری پێ بدات، ئەو کاتە ئۆپرا تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو، ئۆپراش ئەم داوایەی پەسەند کردو وەکو بێژەر لەو کەناڵەدا وەدەرکەوت، دواتر لە ساڵی ١٩٧٣ بووە پەیامنێرو پێشکەشکاری هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی **MTVE**، ئۆپرا بچووکترین پێشکەشکاری هەواڵ بوو لە ناشفیل، کە تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵ بوو.

هەروەها یەکەم ئافرەتی ڕەشپێست بوو، کە لەو پلەیەدا لە ئەمریکا کاربکات، دواتر ئۆپرا بۆ چەندین کەناڵو بەرنامەی تەلەفزیۆنی گوازرایەوەو، تا ئەو کاتەی توانی ببێتە شاسواری ڕاگەیاندن، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٥ بەشداری شانۆی کرد لە ژێر ناوی صۆفیاوە لە شانۆی ڕەنگە وەنەشەییەکاندا بەشداری کرد، کە لە دەرهێنانی (ستیفن بیلێرگ) بوو، کاندید کرا بۆ خەڵاتی ئەکادیمی (ئوارد وفولدت گلوب) بە هۆی ئەو ڕۆڵەوە کە توانی سەرکەوتووانە بیبینێت.

ساڵێك دوای ئەوە واتە: ساڵی ١٩٨٦و لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا، کۆمپانیایەکی تایبەتی بە ناونیشانی (هاربو) دامەزراند، بۆ ساڵی دواترشی دامەزراوەیەکی دیکەی دامەزراند بە ناوی خۆیەوە (ئۆپرا وینیفرەی) دامەزراند، ئەم دامەزراوەیە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو سامانێکی زۆری لە ڕێگەیەوە کۆکردەوە، بەشێوەیەك، تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣ بڕی ٣٢ ملیۆن دۆلاری بەخشی بۆ بەرگریکردن سەبارەت بە دۆزی ڕەشپێستەکان لە ئەمریکا.

خاتوو ئۆپرا یەکەم ئافرەتی ڕەشپێست بوو لە ئەمریکا کە بووە خاوەنی ستۆدیۆیەکی بەرهەمهێنان.

* لە ساڵی ٢٠٠٤ ددا بەرنامەیەکی بە ناونیشانی (زە ئۆپرا شۆ) دانا، کە لە ١١٢ دەوڵەتی جیهان پەخش دەکراو ڕۆژانە ١٣١ ملیۆن کەس بینەری بەرنامەکەی بوون لە سەرتاسەری جیهاندا.

راستییەکان سەبارەت بە خاتو ئۆپرا وینیفری:

* گۆڤاری تایمزی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٨٨ بە یەکێك لە دیارترین کەسایەتییەکانی سەدەی بیستەم وەسفی کردووە، کە زۆرترین کاریگەری لەسەر گەلی ئەمریکی هەبووە.

* خەڵاتی ئالتوونی بە دەست هێنا، بە بۆنەی یادی پەنجا لە دامەزراوەی کتێبە نیشتمانییەکان، بەڵام خەڵاتەکەی ڕەت کردەوە، چونکە بەدەستهێنانی ئەو خەڵاتە لە ئامانجو هیواکانی ئەو نەبوو.

* لە ساڵی ٢٠٠٣ یەکەم ئافرەتی ڕەشپێست بوو، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بە پێی ڕیزبەندی گۆڤاری فوربس پلەی ٤٢٧ بەدەست هێنا، وەکو ملیاردێرێك، کە سەروەتەکەی چەندین ملیار دۆلار بوو، بەمەش چووە ریزی ٤٧٦ ملیار دێرەکەی جیهانەوە، هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٤ پلەی ٥١٤ بە دەست هێنا، کە ئەو کات سامانەکەی گەیشتە ١٠١ ملیار دۆلار، بەمەش بووە حەوتەم ژنە دەوڵەمەندی ئەمریکا.

* ساڵی ٢٠٠٥ ئۆپرا پلەی نۆیەمی لەناو بیست ئافرەتە یەکەمەکەی کە زۆرترین جەماوەرو گەورەترین کاریگەرییان هەبووە، لە ڕووی ڕاگەیاندنو ئابوورییەوە.

* ئۆپرا سەروەتەکەی تەنها بۆ خودی خۆیو کەسە نزیکەکانی قۆرخ نەکردبوو، بەڵکو سەرپەشتیو بەخێوکردنی پەنجا هەزار منداڵی ئەفریقی گرتبووە ئەستۆ! کە مانگانە مووچەی بە پێویستی ژیانیان پێ دەدان.

* ئۆپرا دەستپێشخەری کر بۆ درووستکردنی گەورەترین کتێبخانە لە جیهاندا بەبێ بەرامبەر؛ بۆئەوەی سەرجەم فێرخوازانی جیهان بۆ بەدەستهێنانی زانستو مەعریفە ڕووی تێ بکەنو سوودی لێببینن.

* لە ساڵی ٢٠٠٥ مەڵبەندی دووەمی لە ڕیزبەندی فۆربسدا وەرگرت، هەروەها چووە ڕیزی سەد کەسایەتییەکەی جیهانەوە.

* تێکڕای داهاتی ساڵانەی ٢٢٥ ملیۆن دۆلار بوو.

* بەرنامەکەی تەنها لە ڕێگەی ڕیکلامەوە ساڵانە ٢٦٠ ملیۆن دۆلاری بەدەست دەهێنا.

* ئۆپرا بۆ کەسایەتی ساڵی ٢٠٠٨ کاندید کرا، لەلایەن کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکانی ئاژەڵو کۆمەڵەی مرۆیی سەبارەت بە مامەڵەیەکی ڕەوشتییانە لەگەڵ ئاژەڵاندا.



# چۆن بتوانم هاوسەرەکەم بەختەوەر بکەم؟

و: بەختیار عەبدوڵڵا

چۆن بتوانم هاوســەرەکەم بەختەوەر بکەمو جگە لەمن بیر لە هیچ ئافرەتێکی تر نەکاتەوە؟

لە هەندێك کاتدا ئەستەمە بتوانی بیربکەیتەوە، چۆن دەتوانی هاوبەشــی ژیانــت وا لێبکەیت هەســت بە بەختــەوەری بکات؟! پەیوەندیی نێوانتان پێویســتی بەچەند بەرکەوتنێکی (ڕۆمانسی) سۆزداری هەیە، کە پێویستی بەوە نییە لە دەرەوەی نەریتی باوو ئاســایی بێت، یان زیادەڕۆیی تێدا بکرێت، بەرکەوتنی ڕۆمانســیی ســادە جیاوازی بەدی دێنێتو دەبێتە گرنگی پێدانو پەســەندی هاوسەری ژیانت، ئەمانە کۆمەڵێك بۆچوونن؛ بۆئەوەی بەختەوەرو خۆشــبەخت بیت، هەموو داپیرەیەك، ئــەم ئامۆژگارییانەی نەوە کچەکانی خۆی دەکات، چونکەپەیوەندیی خێزانی لەکۆندا زیاترو پتەوترو گەرموگوڕتر بوو وەك لە ئێستادا.

**١- لاواندنەوە:** (ئادەم) - سەلامی خوای لێبێت - لاواندنەوەی زۆر پێخۆش بــووە، خاتوونی بەڕێز هیچ خراپییەکی تێدا نییە، کە ڕۆژانە چەند خولەکێك، یان چەند سەعاتێك ئەم کارە بکەیت، ئــەوەش بەپێــی بارودۆخی هەر کامێکتــان، هەندێك لاواندنەوە وەکو بەهــارات وایە کە خواردن پڕ تامو چێژ دەکات، لاواندنەوە پەیوەندیی نێوانتان زیاتر گەرموگوڕ دەکات.

خانمی ئازیز، خەیاڵ بکە هاوســەرەکەت لە کار دەگەڕێتەوەو تۆش لــە ئامێزی دەگریــت، لەگەڵ دەربڕینی کۆمەڵێك وشــەی لێوانلێــو لە ئەویــنو لاواندنەوە، بزانــە چ جادوویەك دەکات لە پەیوەندیی نێوانتان.

**٢- دیارییەکــی جــوان بــۆ هاوســەرەکەت بکڕە:** پێویســت نییــە دیارییەکەت گرانبەها بێت، باشــتێك بێت پێویســتی پێی هەبێت، یان بەختەوەری بخاتــە دڵیەوە، با دیارییەکەت کتوپڕو چاوەڕواننەکراو (سوپرایز) بێت بۆی، زۆر خۆشحاڵ دەبێت کاتێك دەبینێ تۆ بیرت بۆ ئەو کارە چووە.

**٣- پلان بۆ شــتێکی جوانو خۆش دابنێ:** بەرنامە بۆ شــتێك دابنێ، کە هەست بە ئازادی بکەن تێیدا، پێویستە کورتو جوانو شایســتە بێــت، وەکو چوونــە دەرەوەیەکی کــورت لەگەڵ چەند خواردنێکی ســادە، وەکــو پێزانینێك لە تۆوە بۆ هاوســەرەکەت لەبەرامبەر کاری قورسی چەند ڕۆژێکیدا.

**٤- شــتێکی بۆ بنووســە:** شــتێك بۆ هاوســەرەکەت بنووسە، دەربڕینێکی سۆزدارانە(ڕۆمانســی)و لە شــوێنیك بۆی دابنێ کە ببینێــ؟ وەکو نــاو کتێبخانەکــەی، یان ســەرمێزەکەی، یان لە تەنیشت شوێنی خەوتنی.

لە ڕوانگەی ناسینت بۆی با نووسینەکەت کورت بێت، یاخود درێژیش بێت، بەڵام پڕی بێت لە هەســتو سۆز، ئەوەی کە بۆی شیاوە، ئەوەش شتێکی کتو پڕو لەناکاو دەبێت.

سەرچاوە: http://www.thaqafnafsak.com



# گەر دایکەکان هەموو شتێکیش نەبینن، بە دڵیان هەستی پێدەکەن

و. لە تورکییەوە: گەشبین حسین

بیست ساڵ دواتر، بۆ ئەو شتانە نا کە کردووتە، بۆ ئەو شتانە خەفەت دەخۆیت، کە نەتکردووە بەو هۆیەوە هەڵەکانت چارەسەر بکە... هێندەی دەتوانی بەڵێن بدە، لە دوایدا زیاتر لەوە بکە کە بە ڵێنت لەسەر داوە... دڵی چاو ئەو شتانەش دەبینێت، کە چاو نایانبینێت ئەوانەی کە دەیانەوێت خەمەکانیان لەفرمێسکەکانیاندانقوم بکەن،پێیان بڵێ کە خەمەکان مەلەدەزانن. لە فڕین بۆ سەر لقەکان مەترسە، میوەکە لەوێدایە... پیاوی گەورە گەورەییەکەی، بە ڕەفتارەکانی پیشانی پیاوی بچووك دەدات.... لە مێژوودا کتێبی کاریگەرم خوێندۆتەوە، لەگەڵ ئەوانەدا تاکە شت کە تێیدا هاوبەشین بەسەرسامییەوە بینیم کە کاتە، ئەوانەی دنیایان گۆڕی، ڕۆژەکانیان وەکو تۆو من٢٤سەعات بووە.... ئەگەر بۆ دەستپێکردن چاوەڕێی باشترین کاتیت، ڕەنگە هەر دەست پێنەکەیت، ئێستە دەست پێبکە، ئێستە لەو شوێنەی کە هەیت بەو شتانەی کە لەبەردەستدان دەستپێبکە... دۆست ئەو کەسەیە کە هەموو شتێك لەبارەی تۆ دەزانێت سەرباری ئەمە تۆی خۆشدەوێت... هیچ ڕوخسارێکم نەبینی کە لە کاتی زەردەخەنەدا جوان نەبێت... دڵشکانو عاجزبوون خۆی لە خۆیدا خەرجکردنی گرنگترین کاتەکانی ژیانە.

تاقی بکەرەوە، بکەوە ناو مەترسییەوە، زیاتر لە هەموو کەسێکو شتێك باوەڕ بە دەنگە بێدەنگەکەی ناخت بکە.... ئەوانەی زۆربەی کاتەکانیان بە بەدەستهێنانی پارە بەسەر بردووە لە کۆتاییدا تێدەگەن زۆربەی پێداویستییەکان ئەو شتانەن کە ناکڕدرێن.... هیچ کەسێك خاوەنی مسۆگەرکردنی دڵخۆشبوونی نییە، زەمانە کاتو شوێن دەدات بە هەموو کەسێك، ئەمانە شتانێکن کە بۆ ئێمە ماونەتەوە، تاوەکو بە خۆشی پڕی بکەینەوە.... تاکە ڕێگای گرەنتی دڵخۆشبوون دڵخۆشکردنی کەسێکی ترە.... لەو کەسانە ئاقڵتربە کە تۆ بە گێل دەزانن....یان تۆزەکە لە دوکەڵە کە کۆ دەکەیتەوە، یاخود تۆزەکە بە دوکەڵەکە فوت دەدەیت... کارێك مەکە کە بۆ سەرنجڕاکێشانی ئەوانی تر بێت، بەڵکو کارێك بکە کە سەرنجڕاکێش بێت... ژیان زۆر خۆشە بۆ کەسانێك کە دە زانن بۆچی دە ژینو چی دەکەنو بۆ کێی دەکەن، هەر ئەوانەن کە پێناسەی ژیانی ڕاستەقینە دەکەن... ئەوانەی کە دەڵێن ژیان خۆشی تێدا نییە، هەر ئەوانەن کە وەك کەشتییەکی ونبوو، شەپۆلەکان ئاڕاستەکەی دەگۆڕنو ناشزانن بۆ کوێ دەڕۆن... ڕۆڵە شیرینەکەم، لە ئەتەکێتی ژیان بزانە، بەو شێوەیە تامی ژیان دەکەیتو چێژ لە خۆشییەکانی دەبینیت....

سەرچاوە: لە کتێبی: **papatya kokulu hikayeler**



# بزەی منداڵ

سایە سەرگەتی

کاتێک منداڵ بزە دەکات، مانگ شەرم دەکات، باسی جوانی بکات، ئەستێرەکان خەریکن دەکەونە خوارەوە، خۆر نزیکە بتوێتەوە، هەور سەماکەی فراوانتر دەکات، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان هیچ کام لە گۆڕانەکانی سرووشت نابینن، چ بگات بەبزەی پەرییەك. ئەوان هەست بە دەستە نەرمەکانی ئەو منداڵە ناکەن، کە پێڵاوەکانیان بۆ پاك دەکاتەوە، هەست بەجوانیو لێهاتوویی ئەو منداڵە ئەکتەرە ناکەن، کە لە بازاڕدا داوایی پارەیان لێ دەکات. ئەو مرۆڤانە وادەزانن بۆ هەمیشە ئەوان گەورەنو منداڵەکانیش بچووك، بەڵام بچووکەکانی ئەمڕۆ، گەورەکانی سبەین، ئەوانەی ئەمڕۆ، وەڵامی بزەکانیان نادرێتەوە، بیرۆکە فەلسەفیەکانیان بێدەنگ دەکرێن، ئەوانەی کە چیرۆکی شەوانیان تەلەفزیۆن دەیگێڕێتەوە، نەك دایكو باوك. بچووکەکانی دوێنێش هەمان گەورەکانی ئەمڕۆن، ئەو گەورانەیی، کە بەرامبەر هیچ گرفتێك بەرگرییان نییە، ئەوانەیی دکتۆرایان هەیە لە تاوانبارکردنی خەڵکیو بێتاوانی خۆیان، گەورەکانی ئەمڕۆ تەنها بە نووسین دەستی دایكو باوکیان ماچ دەکەن، ئەوانەی بەڵێ بۆ هەمووشتێكو نەخێر ئاڕاستەی هەمووان دەکەن، گەورەکانی ئەمڕۆ، وادەزانن داهێنان ئەفسانەیەکە، تەنها ئەورووپا درکی پێدەکات، لای ئەوان وڵاتەکەمان خراپترین شوێنی سەرزەوییە، بەچێژترین کاتەکانیان، کاتی شکستی بەرانبەرە، ئەگەر بیانەوێت خۆیان زۆر مودێرن دەرخەن، لە چێشتخانەیەکی بە ناوبانگ وێنە دەگرن، بەڵام بوەستن، گەورەکانی ئەمڕۆ، دەزانم ماندوون، وابزانم تروسکاییەکانی هیوا، هێشتا لە ناختاندا نەکوژاوەتەوە، هێشتا کات ماوە بۆ سەرکەوتن، بۆ بەدیهێنانی خەونەکانی منداڵیتان، تەنها مەوەستن، بزەکانی منداڵیتان بگێڕنەوە، یادەوەرییەکان، داهێنانەکانتان، هاوڕێکانی منداڵی، هەمووان دووبارە بکەنەوە.

بیرتە بەمنداڵی چەند جیاواز بیرت دەکردەوە، بیرتە چەندجار پێیان دەوتیت بێدەنگ بە، لە گەورەکانی سەردەمی منداڵیت خۆشبە، ئەوان وایان دەزانی فێری ڕەوشتت دەکەن، نەك فێری گرنگینەدان بە هیچ بنەمایەك. کە لەگەڵ یادەوەری منداڵیتدا ژیایت، دەزانیت منداڵەکانی ئەمڕۆ چەند داماون، چەند پێویستیان بەگرنگی پێدانە، چەند ئارەزوویی یاریکردن لە دڵیاندایە، چەند دەنگی گریانیان غەمگینە، ئەوان پێویستیان بەوەیە کە قسەیان لەگەڵدا بکەیت، دەبێت پێیان بڵێیت زۆر زیرەکن، کە دەزانن ڕەنگەکان جیا بکەنەوە، چونکە دەتوانن ڕابکەن کەواتە: پاڵەوانن، پێناسەی مزگەوتیان فێر بکە. وەڵامی بزەکانیان بەرەوە، زۆر بەجوانتر لەبزەکانی خۆیان، تا تۆش سبەی، کە ناچاربوویت گەورەتربیتو پیری ڕووی تێکردیت، بەڕێزەوە بزەت بۆ بکرێت.





# مێردمنداڵ لەنێوان ئازادیو کۆنترۆڵکردندا!

گوڵان حەمەئەمین

یەکێك لە کێشە دیارەکانی دایكو باوك لەگەڵ منداڵە هەرزەکارەکانیاندا، بریتییە لە: داواکردنی ئازادی ڕەها، ئەمەش چەند هۆکارێکی هەیە، هەروەك چۆن چەند زیانیشی هەیە، بەڵکو ئەوەی پێویستە هاوسەنگی هەبێت لەو نێوەندەدا، نە ئازادی ڕەها وەك ئەوەی هەرزەکارەکان داوای دەکەن، نە دەست بەسەرداگرتنی تەواو وەك دایكوباوك دەیەوێت. دایكو باوك بەهۆی پەرۆشی زۆر بۆ ڕۆڵەکانیان؛ بۆئەوەی لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندابن، بەمەبەستی ئەوەی هیچ هەڵەیەك ئەنجام نەدەن، تووشی هیچ خراپەیەك نەبن، دەیانەوێت تەواوی مامەڵەی منداڵەکانیان لەژێر چاودێری ئەواندا بێتو بەئاگاداریو پرسو ڕای ئەوانو بەویستی ئەوان بێت، ئەمەش وا دەکات منداڵ بەرگەی نەگرێتو هەڵبشاخێتەوە بە ڕووی دایكو باوکداو قسەیان بەهەند وەرنەگرێت، سەرپێچییان بکاتو لە ماڵ دوور بکەوێتەوە.. لەهەمان کاتدا پەنا ببات بۆ درۆکردنیش. زۆر گرنگە دایکانو باوکان، ڕۆڵی تەواوی خۆیان ببینن لە پرۆسەی پەروەردەکردنی منداڵەکانیانداو بەهیچ بیانوویەك نابێت پشت گوێیان بخەن وەك هەندێ کات بەدی دەکرێت هەندێ لە دایکانو باوکان بە بیانووی ئەوەی گوێیان بۆ ناگرنو لەقسەیان دەردەچن، منداڵەکانیان دەبینیت زۆر بەئاسانی دەستبەرداری ئەو پرۆسە گرنگە دەبنو خۆیان بێئاگا دەکەن لە منداڵەکانیان، بەڵام لەکاتو سەردەمێکی وەك ئێستادا کە منداڵ ئاگاداری زۆر شتەو دەستی بەزۆر شوێن ڕادەگاتو زۆر پەناش هەیە بۆی، پێویستە دایکانو باوکانی خۆشەویستیش زیاتر گونجاو بن لەگەڵ سەردەمەکەداو هەوڵی هاوڕێیەتییەکی باش بدەن لەگەڵ منداڵەکانیانداو بەپێی توانا حەزو خواستی منداڵەکانیان بەدی بهێننو هەوڵی پڕکردنەوەی بۆشاییەکانیان بۆ بدەن، نابێت پەنابەرنەبەر لێگرتنەوەی تەواوی خواستەکانیان. بۆ هاوسەنگی لە نێوان خواستی دایكو باوك لەگەڵ خواستی هەرزەکاران، دەکرێت سوود لەم چەند خاڵە وەربگیرێت:

١-تێگەیشتنی دایكو باوك لە جیاوازیی ڕۆژگارەکەمان زۆر گرنگە، نابێت بە بیانووی ئەوەی ئێمە وانەبووین سەردەمی ئێمە وا نەبوو تەواوی ئازادییەکانی لاو قۆرخ بکرێت.

٢- هاوڕێیەتیکردنی لاو بەشێوەیەك بچیتە نێو دڵو خواستەکانیو هاوکاری بکە بۆ بەدیهێنانی خواستە ڕەواکانی، ڕاوبۆچوونی خۆتی پێ بڵێ لەسەر خواستەکانی کە بەشیاوی نازانی، لەگەڵ بوونی پەیوەندییەکی تۆکمە، تا وای لێبکەیت بەهۆی خۆشەویستییەوە، بێتە سەر ڕاو بۆچوونی تۆ.

٣- ڕاوێژپێکردنیو بەهەندوەرگرتنی بۆچوونەکانی، ئەمەش وا دەکات هەست بەمتمانەی تۆ بکات.

٤-متمانەی پێ ببەخشەو بەگومانەوە مامەڵەی لەگەڵدا مەکە.

٥-کاتی پێبدەو لەگەڵیدا بدوێو گوێی بۆ بگرە، بەجۆرێك مامەڵەی توند مەکە لەبەرامبەریدا، تا شتانێکت لێبشارێتەوە، یاخود پەنابەرێتە بەر چەواشەکاریو ناڕاستی.



# لە چ تەمەنێکدا

# دەتوانین منداڵ بە تەنها لە ماڵەوە بەجێ بهێڵین؟

بۆ زۆرێـــك لە خێزانەکان پێش دێت، بە ناچاری ئەو بڕیارە بدەن منداڵەکەیان بە تەنها لە ماڵەوە بەجێ بهێڵن. ئەڵبەتە، بە تەنها جێهێشـــتنی منداڵ لە ماڵـــەوە، ڕێچارەیەکی گونجاو نییە، کەواتـــە: ئەوە وەك کۆتا بژاردە ببینـــن. ئەگەر بڕیارە لە چەند کاتێکی دیاریکراودا منداڵەکەتان لە ماڵەوە بەجێ بهێڵن، باشـــترە بۆ ئەو کاتانە بەرنامەڕێژییان کردبێت. ڕێگا بدەن لە کەشـــێکی کتێبخانەی گونجاو لەگەڵ تەمەنی سوود وەربگرێت، یان بۆ ماڵی یەکێك لـــە خزمەکان بڕوات. ئـــەم بەرنامانـــە یارمەتیی منداڵ دەدات زیاتر سوود لە کات وەربگرێتو خەیاڵی ئێوەش ئاسوودەتر بێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا، جاروبار وا پێش دێت منداڵ بە تەنها لە ماڵەوە بەجێ بهێڵرێت، لەم کاتەدا دەبێت چی بکەین؟

## لە چ تەمەنێکدا؟

یەکێك لە گرنگترین پرســـیارەکان لەم بوارەدا ئەوەیە، کە لە چ تەمەنێکـــدا دەتوانین منداڵ بەتەنهـــا لە ماڵەوە بەجێ بهێڵین، هەندێك لە لێکۆڵەران سەرووو ٨ ساڵو زۆرێکی دیکەیان سەرو ١٠، تا ١٢ ساڵ، بە سەرەتایەك بۆدەستپێکردنی ئەو کارە دەزانن. کەواتە: ئەگـــەر منداڵەکـــەت کەمتر لە ٨، تا ١٠ ســـاڵە، بەهیچ شـــێوەیەك تەنانەت بیریشی لێنەکەنەوە کە بە تەنها بەجێی بهێڵن.

## زیانە جەستەییەکان

یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکان لە تەنها جێهێشتنی منداڵ لە ماڵەوە، ئەگەری ڕوودانی ئەو زیانە جەستەییانەیە کە منداڵ بە خۆی دەگەیەنێت. منداڵ لە نەبوونی دایكوباوکیدا، بە ئەگەرێکی زیاترەوە بەدوای کارە ترســـناکەکانەوەیە، وەك ئاگرکردنەوە، یان کارکردن بە ئامێرە کارەباییـــەکان، تەنانەت هەندێك کات گیانی خۆیان لەدەست دەدەن.

## لەبارەی سەلامەتیی جەستەیی منداڵـــەوە، زۆر پێویســـتە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرین:

* داخســـتنی دەرگای ماڵەوە کارێکی باش نییە: هەندێك لە دایكو باوکەکان وا بیر دەکەنەوە، ئەگەر دەرگای ماڵەوە لەســـەر منداڵەکەیـــان دابخەنو بڕۆن، هەموو شـــتێك بەباشـــی دەڕوات.. ئـــەم کارە دەتوانێـــت پێـــش بە هەندێـــك لـــە ڕووداوە ناخۆشو دڵتەزێنـــەکان بگرێت، وەك هاتنـــە ژوورەوەی غەریبە بۆ ماڵەوە، یان چوونەدەرەوەی منداڵ لە ماڵەوەو ڕێگرتن لەو زیانەی بەخۆی دەگەیەنێت، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر ڕووداوێك بۆ منداڵ پێش بێـــت، بۆ نموونە: ئاگرێك بکەوێتـــەوە، یان خۆی بریندار بـــکات، دەرگاکـــە داخرابێت، نـــە ڕێگایەکی هەڵهاتنـــی هەیەو نە دەتوانێت لە کەسێکی دیکەی وەك دراوسێ، یارمەتی وەربگرێت.

* ئـــەو شـــتانەی ئاگـــری پێدەکرێتەوەو دەرمانـــەکان، پێش چوونـــە دەرەوە لە ماڵەوە، دڵنیابن لەوەی کە دوورەدەســـتنو لە جێگایەکی سەلامەتدان.

* فێریان بکەن فریاگوزارییە سەرەتاییەکان چۆن بەکاربهێنن، بۆ نموونە: لە کاتێکی وەك ئاگرکەوتنەوەدا.

## زیانە دەروونییەکان

یەکێکی دیکە لە گرفتەکان بەهۆی بەتەنها جێهێشتنی منداڵ لـــە ماڵەوە درووســـت دەبێت، زیانە دەروونییەکانـــە. منداڵێك لە

و: ڕێڤان عەلی



تەنهایی دەترسێت بە تەنها مانەوەی لە ماڵەوە، ئەزموونێکی تاڵی بۆ دروست دەکاتو زیانی پێدەگەیەنێت. منداڵێک پاش قوتابخانە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو هیچ کەسێکی لێ نییە، هەست بە تەنهاییو بێسەرنجیی دەوروبەر بەرامبەری دەکات، چونکە هەموو منداڵێک حەز دەکات کاتێک لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ڕووداوەکانی ڕۆژانەیان بۆ کەسێک باس بکەن، قسە لەبارەی هەستەکانیانەوە بکەنو گرفتەکانیان بە کەسێک بڵێن، تا ڕەنگە ڕێچارەیەکیان بۆ پەیدا بکەن. کەواتە؛ ئەگەر ناتوانن لە هەمان ئەو کاتانەدا لەگەڵ منداڵەکانتاندا بنو تەنهان، کاتێک دیاری بکەن لە ڕۆژدا بە تایبەت؛ بۆئەوەی گوێ بۆ قسەکانیان بگرن، ئەڵبەتە پەیوەندیو سەرنجو گوێگرتنی ئێوەیە، خواستەکانی ئەو بەدی دەهێنێت، نەکەن بەناچاریو نابەدڵ، ئەم کارە ئەنجام بدەن.

## چەندە بە دڵەڕاوکێی جیابوونەوە ئاشنان؟

هەندێک دایکو باوک، منداڵێکی وابەستەیان هەیەو زۆر لە تەنها مانەوەو جیابوونەوە لەوان دەترسێت، تەنانەت با بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت. بڕیار دەدەن؛ بۆئەوەی فێری بکەن لەسەر پێی خۆی بوەستێتو نەترسێت، وای لێبکەن بە تەنها بێت» دووجار تەنها بێت ئیتر ناترسێت".

"ڕێگە بدە ڕۆژێک لە ماڵەوە بەتەنها بێت، با بزانێت دارودیوار ترسی نییە، "بەڵام لە ڕاستیدا، ئەو منداڵانەی دڵەڕاوکێی جیابوونەوەیان هەیە، وەها بڕیارێک زۆر زیانیان پێدەگەیەنێتو لە پێشتر خراپتر دەبن.

## کاتی جێهێشتن:

باشترە کاتی جێهێشتن، تا دەکرێت کورت بێت، بەلایەنی زۆرەوە ۳ سەعات بێتو زیاتر لەوە بە قازانجی منداڵ نییە. هەندێک لە دایکوباوکەکان، وا بیردەکەنەوە ئەگەر منداڵەکەیان نووستبێت، ئاساییە ئەگەر بە تەنها بێت، تا کاتێک بەخەبەر دێت، بەڵام ئەگەر ڕووداوێکی دیکە ڕوویدا چی؟ ئەگەر زووتر بەخەبەرهات چی؟ کاتێک منداڵ نەخۆشە تەنانەت ئەگەر هەڵامەتێکی سادەش بێت، کات بۆ جێهێشتنی بە تەنها لە ماڵەوە دەگاتە سفر.

## تایبەتییەکانی ئەو منداڵانەی دەتوانن بە تەنها بمێننەوە

منداڵێک دەتوانێت لە ماڵەوە بە تەنها بێت، بڕوا بەخۆبوونێکی تەواوی هەبێت. زۆر نەترسێتو لە دەربڕینی هەستەکانیدا هەست بە شەرمەزاری نەکات. بتوانێت هەستەکانی خۆی بە دایکو باوکی بڵێتو هێندە لەگەڵیاندا پەیوەندییەکی باشو دۆستانەی هەبێت لە کاتێکدا گرفتێک، یان هەر نیگەرانییەکی هەبوو پێش هەر شتێک، ئەوە لەگەڵ دایکو باوکیدا باس بکات، کارامەییەکی وتەیی تەواوی بۆ پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا هەبێت.

سەرچاوە: دستە: ڕوانشناسی ڕشدو اموزش

# تۆ گەورەی

کەرمیانی



تۆ تەنها مرۆڤێك نیت.......،

هەناسەی ژیانی، لێدانی دڵی، خەندەی لێوی، خۆری ئاسمانو سامانی دوای بارانی!

لەگەڵ تۆدا ژیان بەنرخەو هەموو چرکەیەکی، وەکو شەهدی شووشە هەنگوینێك، دڵۆپ دڵۆپ دەرژێتە سەر لێوی ڕۆحم!

تا تۆم نەناسی، وام دەزانی عەترێك نییە لە بۆنی بارانو نانی برژاوو نێرگزەجاڕو گوڵەباخو شەوبۆ خۆشتر بێت!

بەڵام کاتێ بۆنی خۆڵی بەردەرگاکەتم کرد، ئیدی بۆ یەکەمجار، بە عەبیرێك ئاشنابووم، کە جگە لە بەهەشت، هیچ سەرچاوەیەکی نییە!

ئیزنی دام دولبەر، کە بچمە زیارەتی دەرگانەکەی
شەمعی ڕەخشان وا قبوڵی کرد شکور، پەروانەکەی
ئاسمان حەقیە بەخیلبێت و فڕێ دا مانگو خۆر
لەو دەمەی یار خۆی نواندو هاتە ناو هەیوانەکەی - ئەحمەد موختار -

تۆ گەورەی، هێندەی گەورەیی ئەوین..

تۆ بەخشندەی، هێندەی بەخشندەیی باران..

تۆ میهرەبانی، هێندەی گزنگی بەیانیان..

پاکی، هێندەی ئاوی دەستنوێژی جۆگەلە بەفراوێکی هەورامان!!

کێ دەیتوانی جگە لە تۆ، لە ساردترین شەوانی زستانا، وەکو زەرنەقووتە، لەنێو گەرمترین هێلانەی وشەی نەرمدا، لەباوەشم بگرێو گەرمم بکاتەوە، تا چاوەکانم دەچوونە خەو؟!

کێ دەتوانێ جگە لە تۆ، بتوانێ بە من بڵێ: دەستەکانتم بدەرێ، من مرۆڤم! لە کاتێکدا تۆ فریشتە بووی، نەك مرۆڤ!!

من هەمیشە، بە فریشتەکەی خۆم ناوت دەبەم، دەزانم فریشتەیەك بەسە؛ بۆئەوەی هەموو دێوودرنجەکانی چواردەورم ڕاونێو دووریان بخاتەوە!

ئای لە گەورەیی ئەو مرۆڤانەی کە لەگەڵیاندا، ڕۆح دەفڕێ بەرەو ئاسمان، ئەوان هەر بە خۆیان دەڵێن مرۆڤ، بەڵام نازانن؛ شەوانە، تا بەرەبەیان، فریشتەئاسا گوڵبارانمان دەکەن!

تۆ وەرە لە مەحوی بپرسە، با وەسفت بکا!

تۆ وەرە لە دیدەغەزالان، لە حوسنی خۆت بپرسە! تۆ بچۆ نێو گوڵستانو تەماشای باغەوانی ڕەنج بەخەسار بکە!

دای ئیزنی هەرچی دیدەغەزالە، لە گەردی پێی
بێچارە، کلفرۆشە، ڕەواجی کلی شکا -مەحوی-

تۆ گەردی پێت، کلی چاوی دیدەغەزالانە، ئیدی بەرامبەر بە دیدەی تۆ من چی بڵێم؟!

تۆ چوویە باغو پشتی شکا، حەقیە باغەوان
بازاڕی گوڵ شکاوە، دڵی بولبولی شکا - مەحوی -

ئەگەر مەحوی، چاوی فەرهادو دڵی مەجنوونی نەبا، نەیدەتوانی وەسفت بکا، چما وەسفی وەها یارێك، کە بازاڕی گوڵو دڵی بولبول بشکێنێ، بە کێ دەکرێ؟!

تۆ گەورەی، گەر گەورە نەبای، نەمدەتوانی لەنێو خەندەکانتا، هەزارو یەك برینم بشارمەوە!

تۆ گەورەی، گەر گەورە نەبای، لە یەك شەوی ئامێزی تۆدا، هەزارو یەك شەوەی داستانی عومرم، بە کلی چاوانت بنووسمەوەو بە تاڵی بسکێکی تۆوە، هەڵیانواسم!!

گەر گەورە نەبای، نەتدەتوانی لەسەر تاشەبەردی ئەم ڕۆژگارە، گوڵ بچێنی، لە قرچەو گڕی گەرمەسێرا، بست بە بستی وڵاتەکەم، پەپوولەباران بکەی!

گەورە نەبای، نەدەبوویتە شازادەی مەملەکەتێك، کە جگە لە بەفرو گوڵو پەپوولەو شەونمو فریشتە، هیچی دی ناتوانێ پێ بنێتە نێو سنووری!

ئیدی چۆن لە دووریت نەسووتێم؟! ئیدی چۆن بتوانم بژیم؟!

تا بەسەر باغی دڵا بێ، بای خەزانی فیرقەتت
عاریزم بۆ سێوی ڕوخسارت، لە ڕەنگی بەی ئەکا - سالم -

ئیدی چۆن خامەم ناناڵێنێ؟!

ئیدی چۆن غوربەت نامکوژێو بێتۆیی نامخنکێنێ؟!

چۆن بتوانم حوزنی دووری بشارمەوە؟!

چۆن نەنووسم بۆ تۆ؟ بۆ تۆ نەبێ بۆ کێ بنووسم؟!

دەبێ ئەمجارە پێ نووسم، بە نەی بێ
وەرێ خەم ناڵە ناڵێ نەی، کە نەیبێ! - راوچی -

من تەنها لەگەڵ تۆ دەدوێم، من تەنها بەدووی تۆدا دەگەڕێم، من ناتوانم بێ تۆ، تەماشای کاتژمێر بکەم!

ناتوانم بە ڕێگایەکدا بڕۆم، ماچی ژێرپێی تۆی کردبێ!

ناتوانم لەژێر سێبەری دارێکدا دابنیشم، کە زەمەنێك جێژوان بووە!

گەر دەنگی تۆ ئاوابێ، ئیتر هەموو کەون، جگە لە بەستەی حوزن سەمفۆنیایەکی دی، نابیسێ!

گەر سیمای تۆ ون بێ، تروسکەیەك نامێنێ بۆ دڵی من!!

ئیدی مەڵێ مەگری، دەگریم بۆ هەموو چرپەیەکت، بۆ هەموو چرکەیەکت، بۆ هەموو هەناسەیەکت، بۆ هەموو نیگایەکت، بۆ دیداری هەموو بەیانییەكو ماڵاوایی هەموو ئێوارەیەکت.

بێ وەسڵی تۆ، چی بۆ من دەمێنێتەوە، جگە لە هەڵقرچانو گریان؟!

بیابانی فیراقت، وادییەکی گەرمو بێئاوە
قەناعەت گەر بە ئەشکی، ئاتەشی گریەم نەکەم، چی بکەم؟! - ناری -

ئاخر من عومرێك چاوەڕێم کردی، بە هاتنت، یەکەم لاپەڕەی ڕۆژژمێری ژیانم هەڵدایەوە، بە دیدارت بۆ یەکەمجار، بە جوانی ئاشنا بووم!

لۆمەم مەکە، ئەگەر بەدووتا بگریم؛ تۆ هێزی ئەژنۆو میلی کاتژمێرەکەی دەستمی، بێئاگابوون لە چرپەی ڕۆحت، ڕاوەستانی ترپەی دڵمە!

با بەردەوام گوێم لە ئاوازی دەنگت بێ، با خەندەی سەرلێوت ببینم.. ڕۆحم بێ میسكو عەبیری بەهەشتی تۆ، ناژێ!

لە خەویشدا جێم مەهێڵە؛ چونکە من، جگە لە تۆ، خەونێکی دیم نییە لە ژیاندا!

کەس نەڵێ: «کوردی» وەرە تۆ دەس لە یارت هەڵگرە
زەحمەتە، نابێ، مەگەر جووتم لەگەڵ سێدارە کەن

چاوەڕێتم، چاوەڕێی تۆ..!

کەس نازانێ چاوەڕێی کێم، جگە لە خۆت..

چاوەڕێی پەیامنێری بەهەشتو میهری ئاسمانو فراوانی دەریام، چاوەڕێی مامۆستای جوانیو جوانناسیم، چاوەڕێی مرۆڤم!

ئەوا چاوم لەسەرڕێیە بەبێ هەست
ئەوا ڕۆحم لەبەرپێیە، بەبێ دەنگ

# نامە نوورینەکان

ع.ش. شێرکۆ



یەکێك لە مەنزلگاکانی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، مەنزلگای «شەوقو تاسەی دیداری مەحبووبە»، کە ئاواتی هەموو ڕێبوارانی ڕێگای عبوودیەتو مەداریجی سالیکینی هەڵکشانە بەرەو مەنزڵگا بەرزەکانی بەندایەتی!

سەبارەت بە ئایەتی: ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٍ﴾ العنكبوت: ٥ ئیبنولقەییم دەڵێت: ئەمە دڵدانەوەو خەمڕەوێنییە بۆ موشتاقینی دیداری ئیلاهی، خوداوەند بەو کەسانە دەفەرموێ: شەیدایانی دیداری من، دەزانم ئێوە ئۆقرەتان لێ بڕاوە بۆ لیقای من، منیش ژوانم دیاری کردووەو نزیکە ئەو ساتە بێت، کە ساتی ژوانو دیداری خوداوەندە لەگەڵ ئەویندارانی.

ئازیزم، خوداوەند خۆی دەزانێ تاسەی دیدارو هەستی دڵ چەندە ئەستەمە.. ئەو تاسەیە، مرۆڤ وەك مۆم دەتوێنێتەوە، ئەگەر هیوای دیدار نەبایە، دڵ ئۆقرەی نەدەگرتو ئەویندار هەر زوو ڕۆحی دەسپارد.

نالی ناهەقی نییە، کە دەڵێ:

دەمێکە وا لەسەر پێیەك دەسووتێم
لەشەوقی تۆ، بە میسلی مۆمو هەر مام

شەوقی دیدار، شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی خۆشەویستی؛ چونکە ئەو تاسەیە بۆ دیدار، سەفەری بەردەوامی دڵە، بەرەو لای مەحبووب!

ئیمامی قوشەیری دەڵێ: تاسە، هەژانی دڵە، بۆ لیقای مەحبووب!

یاخود دەڵێن: تاسەی دیدار، هەڵقرچانی ناخو گڕگرتنی دڵو لەتبوونی جگەرە!

هەرچەندە خۆشەویستی، گەورەترە لە تاسە؛ چونکە تاسە، بەرهەمی ئەوە، هێزی ئەو تاسەیەش، سەرچاوەکەی ئەو خۆشەویستییەیە!

یەحیای کوڕی موعاز دەڵێ: نیشانەی تاسەو شەوقی ڕاستەقینە، بڕینەوەی ئەندامەکانە لە شیری ئارەزوو شەهەوات!

چونکە ئەو کاتەی ئەویندار، وەکو پەروانەی دەوری چرا، هەڵدەقرچێ لە دووریی مەحبووبیو تاسەی دیدار هەراسانی کردووە، ئیدی ئاوڕ ناداتەوە بۆ لای هیچ ئارەزوویەك!

بۆچی خۆشەویستییەك دەمێنێ، لە زەتێك دەمێنێ، بیری لێ بکاتەوە.. جگە لە بیرکردنەوە لە لەزەتی دیدار؟!

خواناسێك دەڵێ: نیشانەی تاسەی حەقیقی، حەزکردنە بە مردن؛ بۆ گەیشتن بە لیقای خوداوەند، لە کاتی خۆشیو ڕاحەتدا، هەروەکو یوسف پەیامبەر (سڵاوی خودای لێ بێ)، کاتێك خرایە نێو بیرەکە، نەیگوت: خودایە ڕۆحم بکێشەو ڕزگارم بکە، یاخود کاتێك خرایە نێو زیندان، وەهای نەگوت!

بەڵام کاتێك دەسەڵاتی کەوتە دەستو هەموو موڵکی میسری کەوتە ژێر ڕکێف، لە لووتکەی دەسەڵاتو خۆشیو موڵكو سەروەتدا، داوای گەڕانەوەی بۆ لای خوداوەند کرد: ﴿ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾ یوسف: ١٠١

تاسەی دیدار، گڕو کڵپەی ئاگرێکە، بە ئاوی لیقا نەبێ، بە هیچ شتێك دانامرکێ!

خۆ ئەوە نەبێ بە گەیشتن بە مەحبووب، ئیدی دڵ ئارام بگرێو لە هەژانو هەڵقرچان بوەستێ! بەڵکو ئەو کاتەی نووری مەحبووب دەردەکەوێت، ئیدی مەپرسە دڵ چی بەسەر دێ!!

هەروەکو شاعیر دەڵێ:

وَأَبْرَحُ مَا يَكُونُ الشَّوقُ يَوْمَاً   إِذَا دَنَتِ الخِيامُ مِنَ الخِيامِ.

جونەیدی بەغدادی دەڵێ: لە سەری سەقەطیم بیست، کە دەیگوت: مەقامی شەوق بەرزترین مەقامی عاریفانە، ئەگەر بیگەنێ؛ چونکە کاتێ دەگاتە ئەو مەقامە، ئیدی لە هەموو شتێ بێئاگا دەبێو ئاوڕ بۆ لای هیچ شتێ ناداتەوە، کە لە مەحبووبی دوور بخاتەوە!

هەر بۆیە ئەهلی بەهەشت، وێڕای ئەو هەموو نازونیعمەتە، بەردەوام بەتاسەن بۆ دیداری ئیلاهی!

ئەو هەموو خۆشیو لەزەتەی بەهەشت ناتوانێ تاسەی دیداریان دامرکێنێو شەوقی مەحبووبیان لا فەرامۆش بکات!

چونکە تاسەو ئیشتیاقی دڵ، بە خودی دیداریش دانامرکێ، ئەو کاتەی دڵ بە ئەویندار شاد دەبێ، ئیدی دەداتە قوڵپی گریانو چاویش ئەسرینی دیدار دەڕێژێ!

تاسە کە هێندە گەورەیە، ناتوانێ باوەڕ بکا، ئەوا گەیشتووە بە دیدار!

ئەو ساڵەهای ساڵە دەسووتێ، ئێستا چۆن قەناعەت بە خۆی بکات، کە گەیشتۆتە خزمەتی مەحبووب؟!

ئیبنولقەیم دەڵێت: تاسە دوو جۆرە: تاسەیەك بۆ دیدار، ئەمەیان بە دیدار دادەمرکێ، بەڵام دووەمیان کە تاسەی ساتی دیدارە، ئەمەیان هەرگیز کۆتایی نایەت؛ چونکە ئەوە ئاوێزانبوونی ڕوحە بە مەحبووبەوە! ئیدی ئەوە هەتاهەتا دەمێنێ!!

ئیمامی نەسر ئابادی دەڵێ: خەڵکی هەموو، مەقامی شەوقیان هەس، وەلێ مەقامی ئیشتیاقیان نییە!

چونکە هەرکەس بگاتە ئەم مەقامە، ئیدی تێیدا دەتوێتەوەو ون دەبێ، ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرێ!

عاریفان دەڵێن: ئەوەی موشتاقی خودا بێ، هەموو شتەکان موشتاقی دەبن!

ئازیزم با لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەین! ئەم ڕستەیە، وشەگەلێکی ئاسایی نین!

یەکەم جارە لە ژیانمدا، بەرامبەر ڕستەیەك کە سەرچاوەکەی ﴿ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٍ ﴾ە ، ئاوا هەست بە خەجاڵەتیو شەرمەندەیی بکەم!

ئایا ئێمە، موشتاقی ڕاستەقینەی خوداین، یان موشتاقی شتەکان؟! لە کاتێکدا بۆ ئەویندارێك کە لە مانای ئەوینی حەقیقی گەیشتبێ، دەزانێ کە هیچ شتێ حەدی نییە، لەگەڵ مەحبووبدا زیکر بکرێ!!

گەر بەتەواوی، ڕووی دڵمان بکەینە خودا، جگە لە تاسەی دیدار، موشتاقو چاوەڕوانی هیچ نەبین، ئەوا هەرچی هەیە، بەشوێنماندا ڕادەکات!

زاتی خوداوەند، ئارەزووی لیقاو دیدارمان دەکا، "مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ".

خۆزگە هەریەکێك لە ئێمە، لە خۆی دەپرسی: ئایا من، بەڕاستی موشتاقی دیداری خودام؟!

ئافرەتێك، کوڕێکی لاوی لە سەفەر بوو، کاتێك گەڕایەوە، خزمو کەس هەموو، خۆشحاڵو سەعادەتمەند بوون بە هاتنەوەی، کەچی ئەم دەستی کردە گریان!

لێیان پرسی بۆچی دەگریت؟! لە وەڵامدا گوتی: گەڕانەوەی ئەم لاوە، ڕۆژی گەڕانەوە بۆلای خودای هێنامەوە یاد!!

هەموو دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا، بەڵام چۆنو بە چی؟!

دەتوانین بیلال ئاسا، لە دواساتەکانی مەرگدا، بە چرپەی لێوەکانمان بجووڵێنینو بڵێین:

غَداً نَلْقي الأَحِبَّة.. مُحَمَّداً وَصَحْبَهُ

بەخودات دەسپێرم...

# لەگەڵ «ڕاوچی»ی شاعیردا



شاعیر ناوی مەلا کەریمی سارده کۆسانییە، ناسراوە بە "ڕاوچی" ساڵی ١٩٢٦ز، لە گوندی سارده کۆسانی، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هاتۆتە دونیاو لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا، لە ساڵی ٢٠٠١ز، کۆچی دوایی کردووە.

شاعیر یەکێکە لە شاعیرە بەتواناکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانو خاوەنی شیعری بەرزو جوانە.

ئەمەش چەند نموونەیەك لە شیعرەکانی:

شەوە، دەستو دەمو داوێن سرەوتوون
دزو ڕێگر، دڕو دارۆغە خەوتوون
کەچی دەستی بزۆزی تۆ لە بەختم
لە نابێو وا مەکەو لاچۆ نەکەوتوون

***

دە بەس بشکێنە ئاوێنەی دڵی لاو
بەشی بۆ هەر تمشا بێ لە باڵاو
گوڕووی ماچێکە، تا ماوم لە گۆڕێ
لە گۆڕا هەر کراسێکەو گەزی جاو

***

لە جێژوانی شەوێ دی، تا بەیانی
چ دەردێکی بە من دا، چاوەڕوانی
چ نەنگە بۆ کچێکی کوردەواری
دەمێ وادەو دەمێکی دی، ژیوانی

***

هەناسەم بەرد ئەتاوێنێ لە دووریت
دەسم ناگاتە داوێنی سەبووریت
کزو کۆڵو کلۆڵی هێلی پیریم
کە نەخشاوم بەرەو تۆ، تۆ دەبووریت

***

**ڕاوچیی ئەوین**

بەسەر چووەو سەرم دانا لە بەر پێی
کەچی نەیگوت: چییە؟ بۆچی بە سەر دێی
نەهاتیم بوو، بەسەرهاتی نەپرسیم
هەرچەندە فرمێسکی ڕوونم، ڕشتە بەر پێی
هەناسەم ڕوومەتی گەزتو بەسرتە
گوتم: کەنگێ دەپشکوێیو وەبەر دێی؟
گوتی: ناگاتە خەرمانەی گوڵی ڕووم
دەمت، تاکوو دەمێ نەکوڵێو نەبرژێنێ
گوتم: گیانم ڕەها کە، با ڕەها بم
گوتی: دیلی منە گیانت، لەهەرجێی
گوتم: دووریتە هۆی هێلیو کۆڵۆڵیم
گوتی: نێزیك وەبی، کاڵی، دەسووتێی
ئەوەن گریامو شینم خستە کێوان
ئەوەن ئەستۆکەچیم دانا کە بەر پێی
بەزەی هاتێو دەمی دامێ دەمێکی
گوتی: "ڕاوچی" ئەوینی، با نەڕەنجێی